اصل پانزدهم قانون اساسی جمهوری اسلامی ایران:

زبان و خط رسمی و مشترک مردم ایران فارسی است. اسناد و مکاتبات و متون رسمی و کتب درسی باید با این زبان و خط باشد ولی استفاده از زبانهای محلی و قومی در مطبوعات و رسانه‌های گروهی و تدریس ادبیات آنها در مدارس در کنار زبان فارسی آزاد است.

# نێوەڕۆک




چپ: از شرکت ایرانچپ
ش ٣٢٨١


وینەی رووبەرگ : تابلۆی نەقاشی هونەرمەند کاک مستەفا شێرزاد
وێنەی پشت بەرگ : دیمەنی گوندی سەوجە لە ناوچەی شنۆ .

وێنەی لاپەڕی ٢ – دیمەنی بەرەبەیانی دەریاچەی زرێواری مەریوان .

گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی
سروە
لە ژێر چاودێری دەستەی نووسەران
خاوەنیشان : ورمێ ـ خیابان شهید باکری ـ نهش کوی ساعد ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ( مرکز نشر فرهنگ و ادبیات کردی ) تلفن : ٣٥٨٠٠


ویڕای سڵاوو پیرۆزبایی جێژنی مەولوود ،جێژنی لە دایک بوونی فەخری عالەم خۆشەویستی خودا ،پێغەمبەری ئاخرزەمان (د.خ) لە ئێوە خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکانی "سروە" لەگەڵ هیوای هاتنەدی هەموو ویست وئامانجە پیرۆزەکانی ئەوگەورەپیاوەی مێژووی جیهان وبەئاواتی سەرکەوتن وبەختەوەری پەیڕەوانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ،ئەوەسەروتاری ئەمژمارەی "سروە" دەست پێ دەکەین .

لەژمارەکانی رابردوودا لەسەر بابەخی قەڵەم وئەرکی قەڵەم بەدەست وجیاوازی نێوان دەروەستی وبەرەڵڵایی ،دوایین. ئێستاش هەروەک بەڵێنمان دابوو سەرەڕای شی کردنەوەی مەبەستەکەمان ،سنووری نێوان بەرپرسی وبەرەڵڵایی باشتر روونتردەخەینەبەرچاو .

لەنێوپیشەجۆربەجۆرەکانی دنیای ئەمرۆ داکاری نووسەر وەک کارێکی پڕبایەخ وبەنرخ خۆدەنوێنێ.لەدنیای زانست وفەندائەرکی پەرەپێدانی زانست وراگواستن ونا ساندنی زانستەنوێکانی

بەئەستۆیەدیارەئەمەش لە زاتی قەڵەمدا یەوئیعتیباری نیە .تارادەیەک کەدەتوانین بڵێین جگەلەوبەیت وباوانەی سینگاوسینگ پارێزراون تەنیا قەڵەمەکە پارێزەری زانینەکانی مادی ومەعنەوی یەوئەم میراتە گەورەعیلمی یەی پێشینیانی ئێمەی کەبریتیە لەبەرهەمی رەنج وکوێرەوەری دەیان ساڵەی نەسلەکانی پێشوولە مەترسی نەمان وفەوتان پاراستووە.

**بەرفراوانی وگیرایی زمانی قەڵەم،پاراوی وتەئسیری خێرای نووسینەکان ،هەروەها ئاسان وهەزاران دەست کەوتنی بڵاوکراوەوتەبلیغی یەکان بوونەتەهۆی ئەوەکەئاپۆرەیەکی زۆرلەدەوری کۆببێتەوە وژمارەیەکی زۆرتریش لەبەروبووی بەهرەوەربگرن. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە وێڕای هەوڵدانی بەکەلک و ئینسانی نووسەرانی دەروەستە دوژمنانی مرۆڤایەتیش،وەخۆ کەون وشەپۆلێکی بەسام و گەورەی نووسینی دزێو و تێکدەرورووخێنەروەڕێ بخەن بۆ لەنێوبردنی ئیستیعدادەکان ، هونەروقەریحەپاکەکان ویالادان وبەردەست کردنیان .**

سیاسەتەئیستیکباری یەکان بۆدرێژەدانی ژیانی پڕنەنگی خۆیان ،کەبێ گومان بەبێ خەیانەت وجینایەت وهەق کوژی درێژەی نابێ پترلەجاران لەنەخشی قەڵەمدەگەن و پوولْ وسەرمایەیەکی زۆری لەسەر دادەنێن .میلیۆن میلیۆن وتار وکتێب وگۆوارورۆژنامەلە لایەکەوەورایەڵی بەرینی هەواڵدەرەکان وفیلمەکان و....کەئەوانیش پەروەردەی قەڵەمن ،لەلای دیکەوە ،ئەم قسەمان بەتەواوی دەسەلمێنن.

بەڵێ ئەمڕۆلەجیهانی قەڵەم و نووسیندا تەقەلایەکی زۆر دەکرێ تابەگۆڕین وئاوەژوو نیشاندانی راستی یەکان، بەشێکی زۆرلەخەڵکی جیهان بخافڵێن،شۆڕشگێڕان و چەوساوانی رزگاریخوازلاڕێ بن وبەمەسایلی لاوەکی وهیچ و پووچەوەخەریک بن،تابەڵکوولە گەیشتن بەئامانجەپیرۆزەکانیان کەبنەبڕکردنی ئیستیعماری کۆن ونوێ بە یەکەمهەنگاوی دەژمێردرێ ، دووربکەونەوەوهێزەخواپێداوەکانیان ،هەرچەندلەقالبێکی شۆڕشگێڕانەوبریقەداریشداکۆ بووبێتەوە ،بۆخزمەت بەمەبەستەکانی ئەوان وەگەڕ بکەوێ .لێرەدایە کە وشیاری وردبینی ووریایی قەڵەم- بەدەست ونووسەری دەروەست پترلەجاران پێویستی خۆی دەنوێنێ ودەردەکەوێ کە گەڕانی قەڵەم بەسەرکانەزدا،شتێکی بێ مەبەست نیەودەبێ ئامانج ورێبازێکی بۆدیاری بکرێ .

لەدرێژەی ئەمباسەدا پێویستەزنجیرەوتارێک لەسەر شێوەی کەلک وەرگرتنی ئیمپریالیزمی جیهانی لە قەڵەم پێشکەش بکرێ .ئەگەر بۆمان بگونجێ لەسەروتاری ژمارەکانی داهاتوودا ،یاخۆ لەژێرسەردێڕی مەقالەیەکی سەربەخۆدا لەسەری دەڕۆین .

**لێرەدا ئەوەندەدەڵێین کە زمانی قەڵەم تەنیا راگەیەنەری زانراوەکان نیە ،بەڵکوو زۆرجاردەبێ شتی هەڵبەستراویش دەرخواردی خەڵک بدا .ئەوشتە هەڵبەستراوانەی کەمەکتەب وبیروبڕوا بۆخەڵک دادەتاشن رێبازی سیاسی یان بۆدیاری دەکەن ،ئاکاروکردەوەیان فێردەکەن وتەنانەت دەست دەبەنە نێوپەیوەندی یە ئاسایی یەکان وهەڵس وکەوتی رۆژانەی ئینسانەکانیشەوە وشێوەژیانی دیاری کراووبەرچاوی فیرعەونی یەکانیان بەسەردا دەسەپێنن .**

بەکورتی ئیستیعماری فکری ئامانجێکەکەسیاسەتمەدارانی ئیستیکباروئیلحاددەیانەوی بەهۆی قەڵەمەوەوەدی بێنن. ئامانجێک کەوەدی هاتنی بەمانای زاڵ بوونی دەسەڵاتەشەیتانی یەکانەبەسەرهەموو لایەنێکی ژیانی کۆمەڵایەتیدا جابۆیە بەشەردۆستانی واقیعی وئەوانەی بەدڵ سەرکەوتن وپێشکەوتنی کۆمەڵ بەئاوات دەخوازن ،دەبێ لەدژی ئەوسیاسەتەرابوێستن وسەد

هێندەی جاران سەرنج بدەنە گرینگی نەخشی قەڵەم لەم رۆژگارەدا ،وئەوجۆرەی کەچاکە **ئەمچەکەبەدەستەوەبگرن دڵنیاش بن کەئەگەرهەنگاوێک پاشەکشەبکەن سەنگەرێکیان بۆدوژمن بەتاڵ کردووەو مەودایان داوەتێ سەدهەنگاوی دیکەشیان بەرەوپاش بگێڕێتەوە .**

ئەدی کێ لەنالەی لەگەرووداخنکاوی زۆرلێکراوان وچەوساوان هاوارێکی شادمانی ئەوتۆدەربڕێ کەکۆشکی زوڵم وستەم بلەرزێنێ ؟ کێ دەرکی تاریکخانەی نەزانی وسەرلێ شێواوی مۆربکا ؟ کێ پەردەی ریاودووڕەنگی لەسەرروخساری ئەوفێڵبازانەهەڵداتەوە؟ ولەئەنجامداکێ هیوای دوارۆژێکی رووناک بەولەخۆ غافڵانەی کەفەرهەنگ و مەعاریفی مەکتەبی خۆیان لەبیرچۆتەوە ،بداوگیانێکی تازەیان وەبەربێنێتەوە ،تا لەسەرڕێی خۆیان راوەستن و مل کەچ نەکەن؟

ئێستاکەپێویستی بەهەرە وەرگرتن لەتەعەهودی قەڵەم روون بۆوە ،دەبێ دەست لەسەر ئەوەش دابنێین کە ،سەرەڕای مەسەلەی دەستتێوەردانی ئیستیکبار ،هەرقەڵەم بۆخۆی داوامان لێ دەکا بەچاکەی بگێڕین وئەگەروانەکەین فەسادەخولقێ .**بەقسەیەکی تر قەڵەم وەک تیغێکەکەباخەوان دەرووی پێ هەڵدەپەرتێوێ وخاین خوێنی پێ دەرێژێ .**

کورتی ببڕینەوەقەڵەم چونکەوەک ئامرازێک وایە وەدەتوانێ لەخزمەتی دوژمنانی مرۆڤایەتیشدابێ وریامان دەکاتەوەکەجارێکی ترسەرنجی نەخش وگرینگی قەڵەم بدەین ونووسەرانی وڵاتەکەشمان وشیاربکەینەوە .

ئێمەویڕای بانگ هێشتنی خەڵک وبەتایبەتی خوشک و برایانی قەڵەم بەدەستی کورد زنجیرەوتارێکی هەموو لایەنەمان لەسەر"تەعەهودی قەڵەم وقەڵەمی موتەعەهید" دەستپێ کردووە .لەژمارەکانی داهاتوودادرێژەبەم باسە دەدەین بەوهیوایەکەجێگای رەزامەندی خوای مەزن بێ و ئێوەی خۆشەویستیش بەدڵتان بێ .

**لێرەدابەپێویستی دەزانین سپاسی هەموو ئەودۆست وزانا و ئەدیب وئەدەبدۆستانە بکەین کەلەپاش بڵاوبوونەوەی دووەمین ژمارەی سروەبەرەو پیری گۆوارەکەمان هاتوون ومنەتیان لەسەردا ناوین . چاوەڕوانی هاوکاری پترتانین.**

**خواریارمان بێ .**

---

# سرمقاله

**با عرض سلام و تبریک میلاد حضرت ختمی مرتبت رسول گرامی اسلام (ص) به شما خوانندگان عزیز و محترم "سروه" و باامید تحقق اهداف و خواسته‌های آن رادمردجهان بشری در پهنهٔ گیتی و آرزوی توفیق و سعادتمندی پیروان مکتب حیاتبخش اسلام ،سرمقالهٔ این شماره از "سروه" را آغاز میکنیم.** در دو شماره گذشته در خصوص ارزش و رسالت قلم و قلم بدستان و نیز ضرورت بازشناسی مرز تعهد و لاقیدی سخن گفتیم . مطابق وعدهٔ قبلی اکنون وقت آنستکه ضمن شکافتن بیشتر بحث ، تعیین مرز تعهد و بی‌مسئولیتی را پی گرفت .

نویسندگی امروز بعنوان یکی از کارهای ارزشمند در میان مشاغل گوناگون جلوه میکند و درجهان علم و دانش بعنوان وسیله‌ای مهم برای گسترش علوم ،انتقال و تفهیم یافته‌ها و حقایق تازه کشف شده محسوب میگردد ، این اهمیت نه امری اعتباری بلکه وابسته به ارزش ذاتی کتابت است ، تا آنجا که میتوان صرف‌نظر از محدود محفوظاتی که سینه به سینه نقل گشته ، آنرا تنها پاسدار و نگهبان دانسته‌های مادی و معنوی تلقی کرد که میراث بزرگی از علوم و فنونی که ثمرهٔ تلاش و رنج و زندگی مشقت‌بار نسلهای گذشته است

را از خطر محو و نابودی نگه داشته است .

**وسعت ، گیرائی،نفوذ و ارزانی زبان قلم موجب گشته تا جمعیت قابل توجهی بدان روی آورده و جمعیتی چند برابر از ثمراتش بهره‌گیرند این خود دلیلی بود تا در کنار تلاشهای مفید و انسانی، دشمنان انسانیت و سودجویان ضد بشر را بتحرک واداشته و موج عظیم نوشته‌های مخرب و ویرانگر را برای نابودی استعدادها ، هنرها و قریحه‌های سالم و یا انحراف و دربندکردنشان براه اندازند .**

. سیاستهای استکباری امروزه برای تداوم حیات ننگین خویش که طبعا ادامه خیانتها و جنایتها و حق‌کشیهای بی‌حسابی را قرین است ، بیش از پیش به ارزش و کارساز بودن نقش قلم پی برده و روی آن سرمایه گذاری کرده‌اند ،میلیونها مقاله ،هزاران هزار کتاب و نشریه و روزنامه از یکسو و شبکه‌های گسترده‌ٔ خبرگزاریها فیلمها و ...که پرورده‌ٔ دیگر قلمند از سوی دیگر ،دراثبات این مدعا جای هیچ ابهام و تردیدی باقی نمیگذارد ،

آری امروز در جهان قلم و نویسندگی تلاش بسیاری صورت میگیرد تا با قلب حقایق و وارونه‌ساختن آنها ، بخش عظیمی از مردم جهان را در غفلت نگه‌داشته و با ایجاد انحراف در مسیر انقلابیون و مستضعفان ستیزه ـ جوی و مشغول ساختنشان به مسائل فرعی و غیر اصولی ، آنان را از دستیابی به اهداف رهائیبخش مکتب که نابودی سیاستگزاران استعمار قدیم و جدید ،گام اول آن بشمار میرود ،دور ساخته و چه بسا موجودیتشان را هرچند با قالبهای پر طمطراق انقلابی همراه باشد ،در مسیر خود بکار گیرند ،اینجاست که ضرورت هشیاری ،تیزبینی و آگاهی قلم بدستان متعهد بیش از پیش ظهور میکند و لزوم جهت‌بخشی و هدفدار ساختن هرچه بیشتر تلاشهای قلمی نمایان میگردد .

در راستای این بحث طرح سلسله مطالبی در زمینه شیوه‌های استفاده‌ٔ امپریالیسم جهانی از قلم بسیار ضروری ، قابل استفاده و آگاهیبخش استکه اگر فرصت بدست داد در سرمقاله و یا با عنوان مستقلی بدان خواهیم پرداخت

**در اینجا بعنوان اشاره یادآوری میشویم که ( زبان قلم همآره ناقل یافته‌ها نیست ، بلکه در بسیاری از موارد می‌باید یافته‌ها را هم بخورد مردم دهد ، همان یافته‌هائی که با نامهای زیبا و فریبنده برای مردم** مکتب و اعتقاد ساخته ، مشی سیاسی تعیین کرده ، اخلاق آموخته و حتی درخصوصی‌ترین روابط و مناسبات شخصی و خانوادگی با ارائهٔ الگوهای ازپیش‌تعیین شده برنامه میدهد و روشن استکه وقتی با تبلیغات گسترده و مستمر تدریجی و هدفدار جای خود را در افکار و زندگی مردم می‌یابد چگونه سرنوشتشان را در جهت تعیین شده از سوی فرعونیان رقم میزنند) **و در یک کلام استعمار اندیشه که برای تسلط بر جمیع ابعاد زندگی مردم شرط لازم و بلکه کافی نیز میباشد ،هدفی است که سیاستمداران و استکبار و الحاد از قلم انتظار تحققش را دارند ،بر این اساس بشر دوستان واقعی و مدعیان حقیقی تعالی انسانیت می‌باید در جهت مخالف آنچه که یاد شد ، به نقش عظیم قلم و اهمیت فوق‌العاده‌اش در عصر حاضر ، توجهی صدچندان نموده و به یک مقابلهٔ جدی و بنیانی دست زده و از این سلاح بصلاح بهره گیرند و مطمئن باشند هرگامی که به عقب بنشینند سنگری به دشمن واگذاشته که بدان صد گام دیگر به عقب خواهندشان نشاند**. چه کسانی ازصدای در گلو خفه شدهٔ مظلومین و محرومین ، غریوی گوش‌خراش

ل ←

لەسەر باڵی سروەی نەمام ،
ئەو بازی رۆح ،
ئەو تاقانە
باڵای پیرۆزی شوانی کورد ،
جوانی یە گرتوویە ئارام ،
ئیعجازە دەستی وێنەگر
بە تروکەیەک ،
لاوکی پێواری سروشت ،
حەیرانی پڕ وردەکاری ،
وەدەنگ بێنێ .
بە وێنەیەک ،
بە دەنگی رەنگی سەد تەرزی
تەزووی هەستی شاعیرانە
بە گیانی بینەر دابێنێ.
تابلۆی بێ خەوشی سیحراوی
گووڕاوی جوانی دیتنە
ماکی جوانییە گراوی
ئەویندار ی بە برینە .

★ ★ ★

لەو دیو دووکەڵی جگارە
گەڵاڵەی لێڵی وەک خەونی
چیای وشکی بەردەڵانە
مەڕ برسیانە ،
تۆ خوا مامە !
کوڵی خەمت بۆ مەڕەکان ،
دادەمرکێ بە جگارە ؟
ئەدی بژیوی تۆ کامە ؟
تۆ خوا مامە ،
ئەگەر هاتم ،
چایەک لە کەتری
ئاوێزانی کۆڵوانەکەت ،
مژێک جگارەی
توتنە هەرزانەکەت
بۆ منی بە تاسە تەرخان کە
ئەگەر هاتم ،
رازی ژین و ژیاری خۆت
هیواکانت ، خەمەکانت
بۆ منی دڵ پڕ بەیان کە .

✻

دەستەی نووسەرانی گۆواری سروە پێی وایە بڕیاردانی دوایی لەسەر مەسەلە بنچینەیی-یەکانی زمانی کوردی نەکاری خۆیەتی و نە کاری هیچ تاکە ماموستایەکی زانا و زمان ناس. هەرچەند کە زۆریش بە ئەزموون و خاوەن ڕا بێ. بۆ کارێکی وا گرینگ دەبێ کۆڕێک یا کۆنفرانس و کۆنگرەیەک لە زانایان و شارەزایانی زمان و ئەدەبی کوردی پێک بێ و دوای باس و لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانە و لێکدانەوەی هەمۆو لایەنە و پشکنینی هەموو کەلێن و قوژبنێکی مەسەلەکە بڕیاری لەسەر بدرێ.هیوادارین هەموو ئەوانەی لەم زەمینەدا ڕا و نەزەروبۆ چوونێکیان هەیە خۆیان بۆ پێک هێنانی کۆڕ و کۆنگرەیەکی وا ئامادە بکەن. نەزەری خۆیان بۆ ئێمە بنێرن تا خۆشمان بیاننا سین و بەبڵاوکردنەوەی نووسراوەکانیشیان بە خوێنەرانی سروەیان بناسێنین و بەم جۆرە چلۆنایەتی بەشدار بوونیان لە کۆنگرەدا دیاری بکرێ. بەڵام بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆوار و .... بەبێ ڕەچاو کردنی ڕێنووسێکی تایبەتی و زمانێکی ئەدەبی دیاریکراو ئیمکانی نیە.بەم بۆنەوە و هەروەها وەک ئامادە کردنی سەرەتای پێک هاتنی کۆنگرەیەکی ئەدەبی لە گۆواری سروەدا زنجیرە وتارێکی زمان ناسی بڵاو دەکرێتەوە کە یەکەم باس لەسەر ڕێنووس لە دوو ژمارەی پێشوودا بڵاو کرایەوە.

ئێستاش باسێک لەسەر زمانی یەکگرتووی ئەدەبی دەست پێ دەکەین.جگە لەمانەش لەمە و دوا بەرەبەرە نەزەر و ڕەخنە و پێشنیاری هەموو خوێنەرانی سروە لەسەر ئەم باسانە بەبێ هیچ چەشنە دەست تێ وەردانێک بڵاو دەکەینەوە،تاکوو ئەم ڕەخنە و پێشنیارانەش بکەونە بەر سەرنجی هەموو لایەنێک و باس و دەمەتەقەیەکی قووڵی ئەدەبی بکێشێنە نێو کۆمەڵ،کە ئەم چەشنە لێ دوانە کاری کۆنگرەکە ئاسانتر دەکاتەوە.داوا دەکەین هەر کەس ڕەخنەیەکی هەیە تەنانەت ئەگەر لەسەر ڕەخنە بڵاو کراوەکانیش بێ، بۆمانی بنێرێ.

جا چ ڕەخنە لەسەر یەک یا چەند خاڵی ئەم باسانە بێ و چ ڕەخنەیەکی هەموو لایەنە لەسەر تەواوی باسەکان، بە شێوەی مەقالەیەکی سەربەخۆ. ئێمە لە سروەدا بڵاویان دەکەینەوە.ئەگەر بارستی نووسراوەکان لە توانای لاپەڕەکانی سروەدا نەبوو تێکڕای ئەو مەقالانە وەک پاشکۆیەکی سروە لە چاپ دەدەین بەڵام تەنیا کۆنگرەیە کە دەتوانێ بڕیاری دوایی لەسەر بدا.بڕیارێکی ئەوتۆیش بۆ ئەوە دەبێ کە هەموومان پەیڕەوی لێ بکەین. بەهیوای ئەو ڕۆژە.

دەستەی نووسەرانی گۆواری "سروە"

**سەرەتا:** لە دانیشتنێکی دۆستانەدا ئەزموونی کورد دەیگوت: "ئێستاش دوای نزیکەی چل ساڵ کار لەسەر شیعر وئەدەب و نووسینی کوردی،خوێندنەوەی نووسراوەیەکی فارسی یا باسی زمان و ئەدەبی کوردی" دەکرا.ماموستایەکی بە

عەرەبیم لە نووسراوەی کوردی لا ئاسانترە . ئەو مامۆستایە رەخنەی لە ئالۆز پلۆزی رێنووسی کوردی دەگرت. پیاو حەق بلێ ناحەقیشی نەبوو . رەخنەکەی لە دوو لاوە جێگای سەرنجە . یەکەم ساغ نەبوونەوەی هەموو نووسەرانی کورد لەسەر رێنووسێکی کوردی تاقانە . دووەم ئەو بێ سەرە و بەرەبییە کە هەرکەس دەستی قەڵەم دەگرێ و لەوەش خراپتر هەر ناشیرێک کە بە خێوی خۆی چوار کتێبان بۆ چوار نووسەر یا شاعیری هەناسە سارد بڵاو دەکاتەوە ، بە کەیفی خۆی و بەبێ گوێ دان بەوانەی پێشتر ئەم کارەیان کردووە ، رێنووسێکی دڵخواز بۆ زمانی کوردی دادەنێ .

**وەنەبێ ئەم بێسەرە و بەرەیی و پاشا گەردانییە تەنیا بۆ رێنووس بێ. کاتێک سەرنجی نێوەرۆکی نووسراوەکانیش بدەین داخەکەمان دوو چەندانە دەبێ . هەرکەس لە ئاشێک لێدەکا و بە لەهجەیەک دەنووسێ . ئەمەش رەسمی هیچ زمانێکی زیندووی دنیا نیە .** هێندێک وا دەزانن ئەمە هەر کوردییە کە لە هەر مەڵبەند و شارێکدا لەهجەیەکی هەیە و زمانەکانی تری دنیا تاقە لەهجەیەکیان هەیە ، بۆیە هەر بەیەک شێوە دەنووسن . دەستەیەکیش خۆ هەڵدەکێشن و بەچاوی گەلانی دیکەیدا دەدەنەوە کە ئەگەر ئێوەی بەناو پێشکەوتوو تاقە زمانێکتان هەیە ئێمەی کورد پێشکەوتووترین و ئەوەندەمان زمان هەیە لە حیساب نایە! !

- بۆ ئەوەی کوڵ و کۆی دڵی ئەم چەشنە نووسەرانە دابمرکێتەوە دەڵێین ئەوە هەر زمانی کوردی نیە کە لە چەندین لەهجە پێک دێ. هیچ زمانێک لە دنیادا نیە وا نەبێ. عەرەبی میسر و عەرەبی لوبنان وەک دوو زمانی جیاواز دەچن، هەروەها عەرەبی ئەلجەزایر و شام و یەمەن و.. و تەنانەت عەرەبی هەر شارێکی وڵاتانی عەرەب لەگەڵ لەهجەی شارەکانی دیکەی ئەو وڵاتە .

سەرەرای ئەم هەموو جیاوازییە ئەدەبیاتی عەرەبی بە زمانێک دەنووسرێ و هیچیان لەو نەزمە لانادەن. هەر واشە زمانی فارسی و تورکی و فەرانسەوی وئینگلیسی و... بەهەر شتێکی دیکەش خۆ هەڵکێشین، دەبێ باسی زمانەکەمان هەر نەکەین . نەک هەر نابێ زمانی خۆمان لە پێشتر بزانین، بەڵکوو دەبێ پێی لێ بنێین کە **زمانەکەمان هەر وەک نەتەوەکەمان زۆر هەژارە و هەتا بڵێی لە دواوەیە . ئاخر کوا خزمەتی کراوە ؟کوا بایەخی بۆ دانراوە ؟کوا بە زمانیان زانیوە ؟**

ئەگەر نەتەوەکانی دیکە (بێجگە لەوانەی ژێر چەپۆکە بوون و هەن)دەیان و سەدان ساڵ خزمەتیان بەزمانەکەیان کردووە و شیعر و پەخشان و چیرۆک و بابەتە زانستی و فەرهەنگییەکانیان پێ نووسیوە ،کەنگێ و لەکوێ و چ ماوەیەک بۆبووژاندنەوەی زمانی کوردی هەوڵ دراوە ؟

خو ئەگەر بمانەوێ گوێ لە دەنگ و باس و بەرنامەکانی دیکەی رادیۆ کوردییەکان بگرین ئەوەندەی لێ جارز دەبین کە مامۆستای ناو نەبراو لە نووسراوە کوردییەکان جگە لەتاک وتەراکێکی ئەو بەرنامانە سەرباقی ئەوەندە لەگەڵ زمان و رێزمانی کوردی بێگانەن کە پیاو حەز دەکا واز لەو چەشنە کوردییانە بێنێ و گوێ لە بەرنامە فارسی وعەرەبییەکان بگرێ.چونکوو بەراستی لەوان زیاتر تێ دەگا .

بەڵێ زمانی کوردی نەک هەر خزمەتی پێنەکراوە و بەرەو تەکامول نەرۆیشتووە ، بەڵکوو بەرەو فەوتانیش چووە. **بەراستی ئەگەر سەرنجێکی نەدرێ و ئەوانەی خۆ بە دڵسۆزی کورد دەزانن بە هانایەوە نەیەن زۆری پێ ناچێ ئەوەشکە ماوە لەنێو دەچێ.بۆ راست و دروستی ئەم قسەیە با بەراوردێکی زمانی خەڵکی شار و گوندی کوردستان**

بکەین .

زمانی دانیشتووانی شارە کوردەکان بە بۆنەی خوێندن بە زمانی رەسمی وڵات و بایەخ دان بەو زمانانە بەهۆی دام و دەزگا تەبلیغاتی و فەرهەنگی‌یەکانەوە ،هەتا دێ لە زمانی لادێ کە ئەم هەوڵدانانە کەمتر کاری تێ کردوون،دوورتر دەکەوێتەوە . ئەگەر گوێ لە کوردی قسە کردنی لاو یا منداڵێکی خوێندەواری خەڵکی شار دەگرین دەبینین زوربەی ئەو رستانەی بەزاریاندا دێ بەپێی رێزمانی فارسی داڕێژراون ( دیارە بۆ کوردەکانی ئەو دیوی سنوور دەبێ بڵێین عەرەبی) . لێرەدا باسی وشە فارسی‌یەکان ناکەین، چونکوو هیچ زمانێک لە وشەی زمانەکانی دیکە خاوێن ناکرێتەوە .لاوە خوێندەوارەکانی ئێمە جوملەکانیشیان فارسی‌یە .چون بە فارسی بیر دەکەنەوە جا دوایە وەری دەگێڕنە سەر کوردی و دەیڵێن **" تۆ چەند ساڵتە "، " من ئەو شتە لە فلانەکەس ناگرم ". "سەعاتی دوو بوو کە زەنگی خوارد "، "ئەو قسەی بە بای فەرامۆشی سپاردووە "، "من بەو کارە هەڵسام "، " لە حەق نەبووریین "، "بەرق رۆیی " ، "ئەویش لە جەریان بنێ "، "فلانە جێگا بە مەسیرم ناخوا"** رۆژ نیە ئەمانە و دەیان جوملەی لەم چەشنە نەبیسین،

جێگای داخ ئەوەیە نەک هەر زمانی لاوەکان و منداڵەکانمان تووشی ئەو نەخوشی‌یە بووە ،بەڵکوو ئەوانەش کە دەنووسن زۆرکەم تووشی هاتوون.لاپەڕەی ئەو چەند کتێب و رۆژنامە و گۆوارانەی جارنا جارێک بڵاو کراونەتەوە و زوربەی وتارە رادیۆیی‌یەکان پڕن لەم چەشنە غەڵەتانە .**سەیر ئەوەیە ئەم چەشنە کوردی نووسانەی ئێمە بۆ ئەوەی بە خەیاڵی خۆیان بە کوردی‌یەکی پەتی نووسیبێتیان بە زەحمەتێکی زۆر تێدەکۆشن تاقە وشەیەکی فارسی وعەرەبی و . . . .لە نووسراوەکانیاندا نەبێ.بەڵام ئاگایان لەوە دەبڕێ کە چوارچێوە و قالبی جوملەکانیان کوردی نیە و فارسی یا عەرەبی‌یە . سەیرێکی ئەم چەند جوملە کوردی‌یە "پەتی"یە بکەن :**

" زمانی کوردی یەکێکە لە زمانە هندو- ئەوروپاییەکان، ئاریەکان،وە زمانێکی سەربەخۆی سەرکەوتووی داگەور وەرگرە ،وە لە ماخە جیا کەرەوە گرنگەکانی بنەماڵەی ئاری ئەوەیەکە لەبنچی داگور وەرگر بە تاو وتێ پێک هاتوون و داتاشینیان تیاجێ بەجێ ئەبێ‌کە بنچەکەی سەرچاوەیە . ".

خوێندن و زانست و فەرهەنگ رێگای‌داهاتوویەکی پڕ لە خێر و بێر و بەختەوەری بۆهەر نەتەوەیەک دەکاتەوە .گەشە کردنی زمان و ئەدەبیش یەکێک لە ئاکامە باشەکانی ئەو پێشکەوتنە یە .بەڵام بەداخەوە بۆ کوردی هەناسە سارد کە بە زمانی خۆی ناخوێنێ دەبێتە هۆی لەنێو چوونی زمانەکەشی

ئێستاش نووسەر و شاعیری کورد بۆ ئەوەی وشە و زاراوەی رەسەنی کوردی بۆ نووسراوەکانی خۆی بدۆزێتەوە ناچارە پەنا بەرێتە بەر لادێ و لە زمانی خەڵکی نەخوێندەوار و چارەڕەشی دێ شت فێر بێ،کە هێشتا لە بەروبووی خوێندەواری و زانست و فەرهەنگی نوێ بەهرەی وەرنەگرتووە .ئێستاش بەیتە کۆنەکان باشترین سەرچاوەی زمانی رەسەنی کوردین.

لە وەزعێکی وادا ئەگەر شاعیرێکی دەربەدەری کورد بۆ دەربڕینی هەستی دەروونی خۆی دەستی دابێتە قەڵەم و شیعرێکی هێنابێتە سەر لاپەڕەی کاغەز ،یا ئەگەر لە هێندێک شوێنی وەک عێڕاق ،یەکیەتی سۆڤیەت و ئێرانی پاش شۆڕشی ئیسلامیدا یا لە نێو کوردە ئاوارەکانی ئورووپادا دەرفەتێک بۆ بڵاو کردنەوەی شیعر و ئەدەبیات و نووسینی کوردی پێک هاتبێ ، لەبەر یەکگرتوو نەبوونی ئەم هەوڵدانانە ،هەر یەکەی

ئەزمێکیلان گرتۆته بەر ،هەر دەسته یەک بە رێنووسێکی نووسیوه و هەر کەسێک رێزمان و لەهجەیەکی تایبەت بەخۆی رەچاو کردووه .تەنانەت کتێب و گۆواری وا بلاو کراونەتەوه که هەر لاپەڕە یا هەر مەتلەبێکیلان بە لەهجەیەک یا بە رێنووسێکی جیاواز لەوانی تر نووسراوه ،ئەم پاشاگەردانی هەرکەس هەرکەسیە گرینگترین هۆی سەر لێ شێواوی خوێنەری کورده . **جا ئیتر چۆن حەق نەدەین بەو مامۆستایەکە پاش نزیک بە چل ساڵ کار لەگەڵ ئەدەبی کوردی ئێستاش نووسراوەیەکی فارسی وعەرەبی لە نووسراوەیەکی کوردی باشتو و ئاسانتر دەخوێنێتەوه ؟**

لێرەدا ئیدیعا ناکەین که دەرمانی ئەم دەردەگرانەمان بە دەسته بەڵام هەروەک لە دوو ژمارەی پێشووی سروەدا ئێمەش وەک زۆر دەستەو لایەنی دیکه رێنووسێکمان هەڵبژارد و ئوسوولی ئەو رێنووسەمان لە دوو بەشدا راگەیاند . لەم بڕوایەداین که بەبێ هەڵبژاردنی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبیش بۆ کورد لەم کارەدا سەر ناکەوین دەترسێین که کاری ئێمەیش سەر لێ شێواوی یەکە زیاتربکا

**هیوادارین وانەبێ و لە درێژەی ئەم کارە گرینگە فەرهەنگیەدا بەهاوفیکری و هاوکاری مامۆستایانی دڵسۆز و خاوەن را رێگا چارەیەک بۆ ئەم گیروگرفته بدۆزینەوه ، ئینشائەڵڵا .**

ئێستاش دەچینەوه سەرباسی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی که بۆ ئەم چارەمان لەبەرچاو گرتووه ، ئەمباسه بەرێکی درێژی هەیەو بۆئەوی زووتر بە ئامانج بگەین زۆر زوو بە سەرچەند باسێکی گرینگی زمان ناسیدا تێدەپەڕین ورای خۆمان لە سەر زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی دەر دەبڕین .

بێگومان هەرکام لەم باسه سەرەتاییانە بۆخۆیپێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی جیاواز هەیە ، که خوا یاربێ لە ژمارەکانی داهاتوودا ، دەیانخەینە بەرباس وزیادتر- یان لە سەر دەڕۆین .

**زمان و لەهجه**

**زمان کۆمەڵە نیشانەیەکی دەنگیه کەئدامانی کومە- ڵێکی ئینسانی بۆپەیوەندی گرتن لەگەڵ یەکتر دیاری دەکەن.** ئەڵبەت ئینسان دەتوانێ جگه لە دەنگ لە رەنگ، و بۆنیش بۆ گەیاندنی مەبەستی خۆی بە کەسێکیتر کەلک وەربگرێ. بۆ وێنه چرای سووررادەگەیەنێ کەماشێن دەبێ لەسەر چوار رێیان رابوێستی و چرای سەوز وەک نیشانەی ئازادی هاتوچۆ دیاری کراوه . یا خۆ ئینسانێک دەتوانێ بۆ پەیوە- ندی گرتنی رەمزی لەگەڵ دوستێکی خۆی بۆنی عەترێکی تایبەتی بەنیشانەدابنێ . ئەم چەشنه نیشانانه زمان نین . **زانستی زمان ناسی ئەو دەسته نیشانه دەنگیانه بەزمان دەزانێ که لە پێشەوه باسمان کرد .**

هەر کۆمەڵێکی ئینسانی زمانێکی هەیه و ئەو زمانه لە روانگەی زمان ناسی یەوه جێگا و نرخی تایبەتی خۆی هەیه ،جا چ زمانی دواکەوتوو- ترین کۆمەڵی ئینسانی وەک خێڵە ئەفریقاییەکان بێ و چ زمانی وڵاتێکی پێشکەوتووی ئورووپایی و ئەمریکایی. زۆر و کەمی ژمارەی ئەو کەسانەی که بە زمانێک قسه دەکەن هەروەها گرینگی ئەدەبی و سیاسی زمانێک لەچاو ئەوانی - تر ، نابێته هۆی ئیمتیاز- ێکی تایبەتی که ئەمیان بە زمان بناسرێ و ئەوانیتر بە لەهجه .

ئەوانەی که یەکێک لەم بابەتانه دەکەنه بیانوو بۆ ئەوەی زمانی نەتەوەیەک بە زمان لە قەڵەم بدەن و ئەوانی تر بە لەهجه بە هەڵە چوون و بۆچوونێکی زانستیان نیه .زانستی زمان ناسی دەڵێ هەموو ئەو زمانانەی که دەچنەوه سەر یەک ئەسڵ و ریشه ،لەهجەن **و** هەموو ئەو لەهجانەش **وەک** برا وان. هیچیان سیمەتی باوکی بەسەر **ئەوانیترەوه**

نیه .

لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی بۆمان دەردەخا کە لەگەڵ ئەوەی هەر وڵاتێک و تەنانەت هەر شار و مەڵبەند و گوندێک لەهجەیەکی جیاواز لەوانی تری هەیە ، نزیکایەتی‌یەکی سەیریش لەنێو زمانی نەتەوە دراوسێکاندا زۆر بەرچاوە ، لەنێو زمانی نەتەوە دوورە دەستەکانیشدا دەبینرێ .

لە ساڵی ١٧٨٦ی ز (١٢٠١ی .ک. م) دا قازییەکی ئینگلیزی بە ناوی ویلیام جۆنز نزیکایەتی زمانی سانسکریتی لەگەڵ زمانی یۆنانی ولاتینی دۆزییەوە .

لەوکاتەوە زانستی زمانناسی پەرەیگرت ودەرکەوت کە هەموو ئەو لەهجە لێک جیاوازانەی کە نزیکایەتی یەکی کەم یا زۆریان لەگەڵ یەکتر هەیە دەچنەوە سەر زمانێکی ئەسڵی .

زمان وەک دیاردەیەکی زیندوو دایم لەگۆڕاندایە بە سەردەمی زووکە وەزعی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی ، دانیشتوانی مەڵبەندێکی لێک دادەبڕی،لەبەر گرانی و کەم بوونی هات‌وچۆ پەیوەندی گرتنی ئینسانەکان لەگەڵ یەکتر دژوار بوو ، لە ئاکامدا زمانی هەرقەوم و تایفەیەک بە ڕێگایەکی تایبەتیدا گەشەی دەکرد و دەگۆڕا . بەم جۆرە جیاوازی لەهجە ...ێک دەهات .

لەهەرجێگایەکیش کە کۆسپ و بەرگرێکی تەبیعی وەک چۆم و دەریا و شاخو داخو بەرزایی خەڵکەکەی زیاتر لێکدادەبڕی جیاوازی لەهجەکان زیاتر دەبوو . هەر ئەمەیە هۆی پەیدا بوونی لەهجەکان دەنا لە قانوونی خیلقەتدا بەبۆنەی زمانەوە مافێکی تایبەتی بۆ هیچ نەتەوەیەک لە چاو ئەوانی تر دانەنراوە و ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش پلەی ئینسانێک بە بەرزتر دەزانێ کە تەقوای هەبێ نە وەک بە بۆنەی قەوم و تایفەو زمانەکەیەوە .

### زمانی یەک‌گرتووی ئەدەبی

لە دنیادا هیچ وڵاتێک نیە کە خەڵکەکەی بە تاقە زمانێک قسەبکەن . ئەگەر ریشەی زمانەکەشیان یەک بێ ئاخاوتنیان بە لەهجەی جۆرا و جۆرە . لەهجە لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر دەگۆڕدرێ . بەڵام ئەم خەڵکە بۆپێکەوە ژیانێکی ئاسایش نیازیان بە زمانێکی هاوبەش هەیە .

لێرەدایە کە دیاری ، زمانێکی یەکگرتوو پێویستی خۆی دەنوێنێ . زمانێک کە بۆ تێک‌گەیشتن بێ،دەرسی پێ بخوێندرێ و کتێب و گۆوار و ڕۆژنامەی پێ بڵاو بکرێتەوە و ....

لەلای ترەوە دیاری کردنی زمانێکی یەکگرتوو بە بێ سەرنج دان بە زمانی زگماکی هەر نەتەوەیەک لەوڵاتێکی فرەنەتەوەدا کۆسپی زۆرتر دێنێتە سەر ڕێگا . منداڵی نەتەوەیەک کە زمانەکەی نەبۆتە زمانی ڕەسمی وڵات ئەگەر هەر لە سەرەتای خوێندنەوە زمانی زگماکی خۆی لێ قەدەغە بکرێ و لە قۆناخەکانی بەرزتری خوێندنیشدا لەزمان و ئەدەبی خۆی بێگانە بمێنێتەوە نەقڵی‌قەلەرەشەکەی بەسەردێ کەویستی لەنجەولاری کەو فێربێ ، فێرنەبوو و ئی خۆشی لەبیر چۆوە . ئەمەیش لە ئاکامدا دەبێتە هۆی کوێر بوونەوەی زەوق و ئیستیعدادەکانی ، جا چ ئیستیعداد و زەوقی و هونەری بێ و چ ئیستیعدادی زانستی و ....

سەرەڕای ئەوەش ، جگە لە زمانی ڕەسمی وڵات کە ئیمکانی پەرەگرتنی هەیە ، زمانەکانی دیکەی ئەو وڵاتە لە گەشە کردن دەکەون و لەئاکامدا تێکڕای زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی وڵاتەکە تووشی کزی و لاوازی دەبێ

کەوابێ ڕێگاچارەی ئەم وڵاتانە ئەوەیە کە وێڕای دیاری کردنی زمانێکی یەکگرتووی هاوبەش بۆ هەموو وڵات ، هەر نەتەوەیەکیش ئازاد بێ زمان و فەرهەنگ وئەدەبیاتی خۆی پەرەپێ بدا .

بۆ دیاری کردنی زمانی یەکگرتوو ڕێگای جۆربەجۆر هەیە . لەهێندێک شوێن

دەسەلاتی سیاسی نەتەوەیەک، دەبێتە هۆی داسەپانی لەهجەکەی بەسەر نەتەوەکانی دیکەی ئەو وڵاتەدا. وەک رووسی بۆ هەموو خەڵکی یەکیەتی سۆڤیەت. لە ئێرانیشدا کەپاش دەسەلاتداری عەبباسی یەکان یەکەمین دەولەتە سەربەخۆ ئێرانی یەکان لە خوراسان دامەزران زمانی فارسی دەری کە لەهجەی دانیشتوانی ئەومەلبەندە بوو بوو بەزمانی رەسمیو ئەدەبی ئێران و بەسەر لەهجەکانی دیکەدا زاڵ بوو. لە و وڵاتانەشداکە تازە لە ژێر چەپۆکەیی ئیستیعمار، رزگار بوون. سەرەرای هەوڵدانی ئازادیخوازانەی نەتەوە رزگارکراوەکان بۆ زیندووکردنەوەی زمانی نەتەوایەتی خۆیان بەکردەوە هەر ئەو زمانە بێگانەی کە پێشتر بەسەریاندا سەپابوو، وەک زمانی یەکگرتوو بەکار دێ، بۆ وێنە لەوڵاتی فرەنەتەوەی هیندوستاندا ئێستاش زمانی رەسمی هەر ئینگلیسی یە. ئەڵبەت لەووڵاتەدا پازدە زمانی ئازاد و زمانی هیندی وەک زمانی هاوبەش راگەیندراوە، بەلام بەکردەوە هەر زمانی ئینگلیسی وەک زمانی رەسمی و هاوبەشیان بەکار دێ.

**جاریوایە دین دەبێتە هۆی پەیدا بوونی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی.** بۆوێنە لەهجەی ساکسی ئاڵمانی لەو کاتەوە وەک زمانی ئەدەبی ئاڵمانی کەوتە برەوکە مارتین لوتێر کەشیشی ٧ ئەلمانی وبناغە دانەری مەزهەبی پرۆتستان لە دژی پاپ و کلیسا راپەری و کتێبی ئاسمانی ئینجیلی وەرگێرا سەر ئەم لەهجەیە.

قەومی یەهوودیش کە بە هەموو وڵاتانی دنیادا بڵاوبوونەوە بە هۆی تەورا تەوە زمانێکی هاوبەشیان هەیە هەر وەها نەخشی قورئانی مەجید لەسەقام گرتنی زمانی ئەدەبی عەرەبیدا حاشا نا کرێ لەهێندێک ناوچەش گرینگی **ئابووری و بازرگانی** ئەوناوچە دەبێتە هۆی گرینگ بوونی لەهجەکەی، لەهجەی جێگایەک کە ناوەندی بازرگانی بێ و خەڵکی ناوچەکانی دیکە بۆ کرین و فرۆشتنی شت و مەک رووی تێدەکەن، سەرنجی خەڵک رادەکێشی و دەبێتە هۆی پێک هاتنی زمانی هاوبەش.

وەک لەهجەی عەرەبی مەککە لەنێو لەهجە عەرەبی یەکاندا ئەڵبەت ئاینی پیرۆزی ئیسلام و قورئان کە بەم زمانەیە لەسەقام گرتنی زمانی یەکگرتووی عەرەبیدا تەفسیرێکی تەواوی هەیە.

**جگە لەم هۆیانەش کتێب و بەرهەمی ئەدەبی و زانستی بە هەر لەهجەیەک زیاتر نووسرا بێ دەتوانێ ببێتە هۆی پێک هاتنی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی.** دیارە ئەم هۆیەش بۆ خۆی زیاتر بەرهەمی هۆیەکانی پێشووە، چونکە و کتێب و نووسراوە و شوێنەواری ئەدەبی وزانستی بە لەهجەیەک دەنووسرێ کە ئەو لەهجە بەبۆنەی دەسەلاتی سیاسی یا وەزعی ئابووری وبازرگانی یەوە بایەخێکی زیاتری پێ درابێ.

**(درێژەی هەیە)**

لە قانوونی ئەساسی کۆماری ئیسلامی ئێراندا هاتووە :
"ئەسڵی پازدەهەم" : **زمان ورێنووسی رەسمی و هاوبەشی خەڵکی ئێران فارسی یە.** سەنەد ونامە و مەتنە رەسمی یەکان و **کتێبی دەرسی دەبێ بەم زمان و رێنووسە بێ** بەلام کەلک وەرگرتن لە زمانە ناوچەیی ونەتەوایەتی یەکان لە بڵاوکراوەکان وراگەیەندرە گشتی یەکانداودەرس گوتنەوەی ئەدەبیاتەکەیان لە مەدرەسەکاندا **وێرای زمانی فارسی ئازادە.**

# رەخنە و پێشنیار لەسەر باس و لێکۆڵینەوە ئەدەبی یەکان

پێشەکی یەک بۆ ئەم زنجیرە باسە

ئەوەی لێرە دەیبینن رەخنە و پێشنیاری ماموستایانی خاوەن ڕا و هەموو خوێنەرە بەرێزەکانی سروە لەسەر باسە زانستی‌یەکانی ئەدەبی کوردیە. خوا یار بێ لەم جێگای گۆوارەکەماندا جار لەگەڵ جار نەزەر و رەخنە و پێشنیاری هەموو خوێنەرانی سروە رادەگەیەنین و دەیانخەینە بەرچاوی خوێنەران. بەڵام پێویستی بە روون کردنەوەیە کە دەقی نووسراوەکان بەبێ هیچ جەشنە دەست تێ وەردان و تەنانەت بەبێ راستکردنەوەی هەڵە ئاسایی‌یەکان (وەک دانانی نیشانەی "ٚ" و "ـ" و "ٙ" و هەڵەی ئیملایی و...) چاپ دەکەین، کەوابێ تکا دەکەین‌کە رەخنەمان بۆ دەنێرن خۆتان چاوێکی دیکەی پێدا بخشێننەوە و بەبێ هەڵە بۆمانی بنێرن، هەروەها ئەوەش دەبێ بڵێین لەگەڵ رێزدانان بۆ نەزەر و رەخنە و پێشنیاری خوێنەرانی خۆشەویستمان، هەروەک پێشتر رامانگەیاندووە بۆ ئەوەی لەو نەزمەی گرتوومانە بەر، لانەدەین هەرچەند بەشێکی زۆر لەو پێشنیارانەشمان قەبووڵ بێ هەتا پەسند کردنی رێبازێکی دیاری کراو لە لایەن کۆڕ و کۆنگرەیەکی ئەدەبی یەوە، لەبەر چاویان ناگرین و تەنیا بو ئاگادار بوونی خوێنەرانی دیکە بڵاویان دەکەینەوە.

هیوادارین لە داهاتوودا تێکرای ئەم باسانە و رەخنەی خوێنەران بە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆ بڵاو بکەینەوە و دەمەتەقەیەکی ئەدەبی بکێشینە نێو کۆمەڵ و مەیدان بۆ پێک هێنانی کۆنگرەی ئەدەبی ئامادە بکەین، لەو کۆنگرەدایە کە گیر و گرفتەکانی ئێستای زمانی کوردی چارەسەر دەکرێ. انشاء الله

## قازی ئەحمەد

## لەسەر رێنووسی کوردی

دەرخستن و بلاوکردنەوەی گۆڤاری "سروە" بێگومان کارێکی گرینگە و بەرهەمی تێکۆشانێکی زۆر و زوربەی کاربەدەستانی ئەم گۆڤارەیە، چاوەروانی درێژە پەیدا کردنی ئەم کارە گرینگەتانم و داوای سەرکەوتنتان ئەکەم.

"کورتە باسێک لەسەر رێ نوسی کوردی" زۆر شایانی سەرنجە و هەڵدەگرێ زۆری لەسەر بنوسرێ. هەروەک خوتان داواتان کردووە پیویستە زانایان و کوردی زانەکان بیر و رای خویان سەبارەت بەو مەبەستە گرینگە بخەنە بەرچاوی خوینەران و ئارەزومەندانی پیشکەوتنی زبان و فەرهەنگی کورد.

هەمو زبانانی دنیا لەسەر ئەم بروایەن کە رێ نوس تاکو سادەتر بێ، پیشکەوتوترە و لەباری لابردنی تەم و نەگبەتی نەزانین و بێسەوادی یەوە بەکەلکترە، هەر لەبەر ئەوەش تێدەکوشن ئاسان ترین و کورت ترین رێگا بدوزنەوە و منالەکانیان لە کەمترین ماوەدا فێری خویندنەوە و نوسینەوە بکەن.

بەداخەوە هەروەک خۆشتان نوسیوتانە،

رێنوسی زبانی کوردی توشی تەنگ و چەڵەمەی جیاوازی سەلیقەی نوسەران و زانایان هاتووە و هەر کەسێک بە پێی بۆچونی خۆیەوە شیوە نوسینێکی هێناوەتە گۆڕێ ، و ئەلف و بێتکەی تایبەتی خۆی دارژتووە ، ئەم جیاوازیانە سەری لە زوران شێواندووە و مەیلی کوردی فێر بونی لە زورکەسدا کز کردووە و ئەبی لە زورترین کاتا پێشی پی بگری ، هەر لەبەر ئەوەش دامەزراندنی ئەو باسە لە گوڤاری سروەدا کاریکی بەپرسانەی بایەخ دارە و ئەتوانی ریبازیک بێ بۆ ئال و گۆری بیر و باوەر لەسەر پێکهێنانی رێنوسیکی یەکگرتوی پەسندکراو بۆ زبانی کوردی .

لەسەر بەشی یەکەمی ئەم باسە چەند نوکتەم بە زەین گەیشتووە کە راگەیاندنیانم بە ئەرکێکی فەرهەنگی زانیوە و بۆتانی ئەنێرم .

١ـ لام وایە بزوینی ( ۆ ) لە ( وو ) باشترە چونکو واژە کورت تر ئەکاتەوە و لە نوسین داجوانترە ، **دۆر** لە دوور، **پۆر** لە پوور جوانترە .

هەروەک ئەزانین رێنوسی کوردی لە پیتی عەرەبی کەلک وەرئەگری بەڵام ئەم رینوسە خاوەنی کاراکتەری زبانی لاتینە . واتا "حەرەکات" لە کوردی دا شکلی پیتیان هەیە ، لە رینوسە جۆراوجورەکانی لاتینی دا گیر و گرفتی "دەنگە"کان بە عەلامەت و نیشانە چارەسەر کراوە و منالەکان زۆر بە ئاسانی فێری خویندن و نوسین ئەبن ، دوپات بونەوەی بزوێن (حەرەکە) ئەبێتە هۆی پچر پچر بونی واژەکان و لەباری فێر بونەوە زۆردرەنگ ئەچێتە زەینی قوتابیەکانەوە ، ئەمە ئەزمونی تاقی کراوەوەی هەمو ماموستایەکی زبانە وشک و گومانی تیا نیە. قوتابی کورد زوتر فیری رستەی سەرەوە ئەبێ تا رستەکەی ژێرەوە :

**نۆری سۆری ئاسو دۆارودۆر خۆی ئەنواند**

**نووری سووری ئاسوودوورا ودوورخۆی ئەنواند**

چونکو لە رستەی یەکەمدا واژەکان تیکدان ، یەکگرتون ، کورتن و زەینی قوتابی ئەیان قۆزیتەوە . بەلام لە رستەی دوهەم دا واژەکان هەلوەشاو و پرژ و بلاون و فێربونیان بو منال دژوارترە . بیانوی هەلبرینی دەست و نەبونی مەکینەی تایبەتیش زۆر کزە و بۆئەوە نابێ پشتی پی ببەستین !

٢ـ دەکارهێنانی " دەنگی" ص لەجیات "س" لە واژەکانی " سەگ " یا " سەت"دا پیویست نیە چونکو لە زور زبانی دیکەی دنیاشدا ئەم جیاوازی یە بەناوچەیی یانە هەن و پیتی تایبەتی بۆ دانانێن .

٣ـ لە سەرانسەری گوڤارەکەدا واژە عەرەبیەکان بە ئیملای عەرەبی نوسراون!! هۆی ئەم کارە نارەوایەم بۆ رۆن نەبۆتەوە و ناچار پرسیارتان لی ئەکەم ئەم کارە لەکام زبان و رێنوسیتری دینادا باوە ؟ **ئەگەر کوردی زبانێکی سەربەخۆیە و پیت و ئەلف بێتکەی تایبەتی خۆی هەیە ئەبی هەموو واژەیەک چ فەرهەنگی و چ عەرەبی بە پیتەکانیخۆی بنوسی** ئایا لە سەرداری دنیایە بیندراوە و بیسراوە فەرانسە زبانیک واژەیەکی روسی یا ئەلمانی بە ئیملاو پیتی روسی یا ئەلمانی لە زبانەکەی خۆی دا بنوسی گەلانی تری دینا نەتەنیا ئەم کارە سەرسور هێنەیان نەکردووە بەلکە تیکۆشاون واژە لاوەکییەکان هێندی قەلت وبڕکەن و سەروگوێ بشکێنن تا بە ئاسانی بویان بنوسرێ و بخوێنریتەوە. بۆ نمونە هیچ ئینگلیزی زبانێکخۆی زەحمەت نادا بلی سەلاحەددین (طلاح الدّین) بەلکە بە ئاسانی ئەلیسالادین Saladin خۆ عەرەبەکانیش خۆتان باش ئەزانن

بە ناوی موعەررەب کردنەوە چ بە سەرواژ ە لاوەکیەکان ئەهێنن !! و ئەلیکساندر ئەکەنە ئەسکەندەر و فلیپوس ئەکەنە فەیلەقوس ئابادان ئەکەنە عوبادان!

لە هەموو زبانێک دا بەپێی خاسیەت و کاراکتەری تایبەتی واژە لیک و لوس ئەکرێن و بە مرووری زەمان زبان خاسیەتی خۆی بەسەر واژەدا ئەسەپێنی . سوچ و گۆشەی لێ دادەتاشێ و ئەی کاتە کەرەستەیەکی لەبار و لەدەستان خۆش کە بەکاری دەکارهێنان بێت، نوسەران پیویستە لە نوسین و ئاخافتن دا خۆیان لەگەل جیانەکەنەوە و ئەم ئال و گورانەی بەسەر واژەکان هاتون بیگرنە بەرچاو. لە زبانی کوردی دا واژەی کومبایـن ( مەکینەی دروینە) بۆتە کومپا ، ئوتاق بۆتە وەتاغ و ساعەت بۆتە سەعات و ... پیویست ناکا نوسەر بگەرێتەوە سەر ریشەی واژەکە ، بۆنمونە بە بیر و باوەری من ئەم وشانەی ژیرەوە ئەبێ بە کوردی بنوسرین :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| عزالدّین | **عێزەدین** |
| طلاح الدین | **سەلاحەدین** |
| شمس الدین | **شەمسەدین** |
| عزت | **عیزەت** |
| لذّت | **لەزەت** |
| عبّاس | **هەباس- عەباس** |
| محمد امین | **حەمەدەمین** |
| محمد رسول | **حەمەرەسو ( ل )** |
| ........ | ........ |

نوسەر ئەگەر زۆر پاپای ئەمە بێ کە ریشەی واژەکە بخاتە بەرچاو ئەتوانی لەناو پەرانتێزا عەرەبیەکەی یا لاتینیەکەی بنوسی .

**۴-** تا ئەو جێگایەی من ئاگادار بم نیشانەی ( ّ ) تەشدید لە زبانی کوردی دا نیە یا تەنیا لە هێندی لە زاراوەکانیا هەبیت ، لە کوردستانی جنوبی دا زور کەم توشی واژەی رەسەنی کوردی ئەبین کە موشەددەد بن . ئەوانەی کە تەشدیدیان هەیە زوربەیان عەرەبین کە بە پیرەوی لە خاسیەت و کاراکتەری زبانی کوردی تەشدید یان نامێنێ :

| | |
| --- | --- |
| محمّد | **محەمەد ، حەمە** |
| عبّاس | **عباس ، هەباس** |
| منّت | **منەت** |

بۆ ئەم واژانەی کە کوردین و موشەددەدن ( یان لە هێندی زاراوە دا موشەددەدن ) بەکار هێنانی ( ّ ) لە دوپات کردنەوەی پیتەکە جوانترە ،ئەگەر چی تا ئێستا ئەم کارە نەکراوە بەلام هیچ ئیرادێکی نیە ئەم نیشانەیەش لە عەرەبی وەرگرین بۆ خزمەت بە رێنوسی کوردی .

| | |
| --- | --- |
| هوررە | **هورّە** |
| چوررە | **چورّە** |
| شیددەت | **شیدّەت** |
| میللەت | **میلّەت** |
| عیللەت | **عیلّەت** |
| ئەییوبی | **ئەیّوبی** |

دوپات کردنەوەی ئەم نوکتەیە بە پیویست ئەزانم کە لە زبانی کوردی دا واژەی موشەددەد زۆر کەمن و لەهێندی زاراوەی ئەم زبانەدا هەر نین ، ئەم واژانەی لە زاراوەی موکریانی دا موشەددەدن زوربەیان لە زاراوەکانی جنوبی دا موشەددەد نین وەک :

| | |
| --- | --- |
| هوررە | **هورە ـ ورە** |
| چوررە | **چورە** |
| گللیرە | **گلیرە** |
| شللیر | **شلیر** |
| قوررە | **قورە** |
| زەررە زەر | **زەرەزەر** |

(اللهم صل وسلم على النبي محمد)

به بۆنەی

# جێژنی مەولوودی پیرۆز

والذين آمنوا وعملوا الصالحات وآمنوا بما نزل على محمد وهو الحق من ربهم كفر عنهم سيئاتهم وأصلح بالهم

چاردە سەدە لەمەو بەر بەرەبەیانی رۆژی دوازدەی ربیع الاول لە پەنا مالّی خوا لە شاری مەککە کوڕێک لە دایک بوو ،کە پاش چل سالّان لەپڕ ئاوازەی گەورەیی ئەو لە دنیادا دەنگی داوە !! ناوبانگی شکۆی هەر لە کەشکەلانی ئاسمانڕا هەتا پێدەشت و دەریاکانی داگرت . لووتکەی کێوە بەرزەکانی لە باوەش گرت . بە کورتی لە ماوەیەکی کەمدا هەرچی تاریکان و شەوەزەنگ هەبوو بە پڕشنگ و تیشکی نادیاری خوا رووناک کردووەوە .

ئەم کوڕەیە ناوی "محمّد" بوو . لە تۆرەمەی " ابراهیم خلیل اللّه " بوو . لە تەمەنی چل سالّیدا لە نەکاو دەبێتە ئاوێنەیەکی بالّانوێنی رەحمەتی ئیلاهی . بە ناوی گەورەترین پێغەمبەر ئەرکێکی گەورەو گرانی دەکەوێتە سەرشان . دەبوو دوای تێکرماندنی بوتەکان و خوابەردینەکان و کەسایەتی پەرستی رۆم و عەجەم لە جێی ئەوان بە هێزترین کۆشکی خواپەرستی دابمەزرێنێ .

گەورەیی و شکۆی ئەم پێغەمبەرە نازدارە تەنیا بەوە وەدیار ناکەوێ کە پێ لە رێباری هەق دەنێ و کەوشەنە دەستکردەکان تێک دەدا هەرچی دەستکردی بەشەرە لە نێوی دەبا ، یا وڵامی خوا لە پشت دیوارە ئاسنینەکان و دەروازە پۆڵایینەکانڕا بە گوێی کیسڕا و تەزار و هەرقەل و قەیسەرەکان دەگەیەنێ ،

بەڵکوو بەوەڕا گەورەیی و شکۆی دەردەکەوێ کە وێرای ئەو هەموو ، سەرکەوتنە کە ، ناوی پیرۆزی لەگەڵ ناوی خوا وێگرادێن و لە دنیادا دەزرینگێنەوە ( اشهدان لا الە الا اللە ) و (اشهدان **محمد** رسول اللە ) . و ئەرکی سەرشانی هەر

# ڕێ و ڕەسمی تایبەتی لەدایک بوونی پێغەمبەری مەزن (دخ) کەلەکوردیدا «مەولوودی» «پێدەڵێن»

موسڵمانێکە کە وێرای ڕەچاوکردنی ئەمرو ، فەرمانی خوا فەرمایشەکانی ڕەسوولی خواش بەجێ بێنێ ( اطیعوالله و اطیعوالرسول ) دیسانیش ئەم سەروەرە ئەوەندە بێ فیزە کە لە دانیشتن و کۆڕو دیواناندا جێگای تایبەتی بۆ خۆی دیاری نەکردووە . هەر جێگایەکی بەتاڵ بووبێ لەوێ دانیشتووە ، نەیهێشتووە کەس لەبەرابەریدا بە پێوە راوەستێ .

بۆ دڵخۆشی دانەوە و سەردان لەنەخۆشە رەش و رووت و هەژارەکان ، بە پێیان سەری لە دوورترین خانووچکەی ئەوان داوە .هەر کە چۆتە بازار کەل وپەلی بۆ جیران و دراوسێ کڕیوە و بەدەستی خۆی بۆی بردوونەوە

هەروەها گەورەیی ئەم زاتە پیرۆزە ، تەنیا لەوە دانیە کە تەواوی مەلایکە و فرشتەکان لە ئاسمان و ئادەمیزادەکان لە سەر کورەی هەرددا باسی گەورەیی و شکۆی دەکەن و خوا و فرشتەکانی سڵاوی لێدەکەن و تەواوی موسڵمانان لەدنیادا مەئموورن ،

هەتا دروودی بۆ بەرێ بکەن ( ان الله و ملائکه یصلون علی النبی یا ایها الذین امنوا صلوا علیه وسلموا تسلیما ) ، بەڵکووشکۆی ئەم رێبەرە بەوەڕادیارەکە لە پلەوپایەیەکی‌ئەوتۆدا هەمیشە وێرای نالەی دەردەدارو بێ هەتوانان دەلاڵێتەوە و بەدووی دەرمان و مەرهەمێک بۆ سرەوتنی دەرد و کوێرەوەری یەکانی ئەوا ندادەگەڕێ.

هەروەها گەورەیی ئەو خۆشەو [illegible] تەنیا لەوە دانیە کە هەزاران هەزار [illegible]ـمان بە درێژایی تەمەنی دنیا بە بۆنەی بەرێوە بردنی دەستوورەکانی ئەو رێگای بەهەشتیان بۆ دەکرێتەوە ولە فیردەوسی خوا دائۆقرە دەگرن . بەڵکوو بەوەڕا شکۆی حەزرەتی محمد وەدیار دەکەوێ کە سەرەڕای ئەو هەموو رێز و بایەخەی لەلای خەڵک و خواهەیەتی ، وەک هەموو ئادەمیزادەیک لە غەزەب وتووڕەیی خوا دەترسێ و لەخەڵکپتر دەپارێتەوە وبۆ وەدەست هێنانی رەزای خوا دژوارترین چەرمەسەری بەدڵ دەسەلمێنێ و ئەوەندە ئەوشار لەسەرشانی قورسایی دەکا کە هاواری زەوی و ئاسمان بەرزدەبێتەوە تا بەڵکوو هیندێک لەم نەوژم و ئەوشارە کەم بێتەوە .

وەهەروەها گەورەیی ئەو تەنیا لەمە

دانیە کە لەکورتترین ماوەدا بەسەر سەر سەختترین دوژمنەکانیدا زاڵ بووە ولە تووڕەترین شارەکانی حیجاز وەک "طائف" ، دوژمنەکانی دەکێشێتە ژێر پەنجەی تۆڵە بەڵکوو شکۆی لێوەدایە کە ئەودەمەی دەرفەتی تۆڵە وەرگرتنیدەست دەکەوێ لەپڕ سەرتابەپای لەش و رووحی دەبێتە مۆمی رەحم و بەزەیی . لە دەنگدانەوە وزرینگانەوەی ( فاذهبوا انتم الطلقاء ) هەزاران تاوانباری مەککە لەسێبەری مەرگرا دەخاتە بەر بەرۆچکەی هەتاوی ژیانەوەی نوێ . تاوانبارەکان تەنیا بە هۆی ئەوەکە رەنگ بێ تروسکەی نووری ئیمان لە دڵیاندا پەیدابێ لە مەرگ رزگار دەکا .

گەورەیی ئەم پێغەمبەرەتەنیا لەوەدانیە

کە لەماوەیێکی زۆر کورتدا بەو دەسکەوتانەی لە غەزادا لەو دوژمنە سەرسەختانەی دەستاند، عەرەبە رەش و رووتەکانی بە ئەنوا دەگەیاند و هەموو پێداویستی یەکی ئەوانی دابین دەکرد ،بەڵکوو گەورەیی ئەو لێرەدایە کە لەسەر ئەم هەموو رایەخ و پێخەف و مافوورە جوانە ڕالەسەر حەسیر دەنوست شوێنی حەسیر لە سەر لاکەلەکەی دیار بوو لە دیوەکەیدا سەنیر بەڵمی خورما، خۆراک چەند کوتە نانی وشک و خواردنەوە جەرەیەک ئاو و لێوان گڵێنە بوون لەوانەش بەدەر ، هیچی تێدا نەبوو .

بە کورتی گەورەیی ئەم پێغەمبەرە لە هەموان پتر لە خووخدەی بەرزی ئەودا بە دیارەوە. بۆیە خوای مەزن دانەری زەوی و ئاسمان گەورەیی و پلەی بەرزی ئەوی لە ئاکاری ئەودا ناساندووە .(وانک لعلی خلق عظیم)یا لە پلەی بەرزی فەخری عالەم را گەیاندوویەتە پلەی فەخری ئەنبیا و مورسەلین. دوازدەی ربیع الاول مەولوودی پیرۆزومبارەکی حەزرەتی محمد (د.خ) مان وە بیردێنێتەوە.

## دوعا وپاڕانەوە لە کوتایی ڕێ وڕەسمی مەولوودیدا

ئەی برای موسڵمان . ئەی خوشکی ئیماندار جێژنی مەولوودی پیرۆزی گەورەی مورسەلین و خاتەمی ئەنبیایان لە تۆ پیرۆزبێ سەرکەوتنی تۆ و هەموو موسڵمانانی دیکە لە رێبازی گەیشتن بە خوو وخدەو ئەخلاقی (محمد)ی لە خوای میری مەزن ئاواتە خوازین.

"لقد کان لکم فی رسول الله اسوه حسنه لمن کان یرجوالله والیوم الاخر وذکرالله کثیرا" سوره ئەحزاب ئایەی ٢١ "

الهم صلوسلم علی النبی محمد.

ربیع الاول ١٤٠٥ ہجری قمری عبدالله احمدیان

# رەخنە و

**نیە لە مومکینێ ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ**
**بە غەیری خاجەیی دیوانی ( عالم الاسما )**

**لەم بەشەدا کە زۆریش سەرنجی خوێنەرانی بەڕێزی ڕاکێشاوە دوو مەبەستمان لەبەرچاوە : یەکەم: ئەوەی کە بە هاوکاری هەموو خوێنەرە بەئەمەگەکانمان هەڵەی ژمارەکانی رابردوو راست بکرێتەوە . دووەم: پێشنیاری خوێنەر بە هەموو ئەو کەسانەی کە بۆسروە دەنووسن یا دەیانەوێ بنووسن راگەیەندرێ . لە راستیدا ئەم لاپەڕە دەبێتە هۆی پەیوەندی گرتنی خوێنەرانی سروە و ئەو نووسەرانەی لە دوور و نزیکەوە شت بۆ سروە دەنووسن .**

بانە :کاک **عطاءاللەقازی زادە**

★لەتەخمیسی هەشتەمی ماموٚستا حەقیقیدا "فەرمانبەروموتاعن" نادروستە و"فەرمانبەر و موتیعن" دروستە .

★ئەگەردەکرێ لەبەشی شاعیرانی کورددا حاجی قادر بناسێنن .

بۆکان : **کاک ئەحمەدی مەولانی**

★لەسروەی ژمارە دوودا ، شیعری ماموٚستای خودا لێ خۆشبوو کاک "محمد صدیق محمودی" بەشێوەیەک چاپکرابوو کەبەبڕوای من چەندرەخنەیەکی لەسەرە :

١-بۆناساندنی ئەونووسەرە جوانەمەرگەوپلەی شیعرو شاعیری ئەوشاعیرەبێ مرادە کەموزۆرمەبەستێکتان نەنووسیوە .

٢-شیعرەکەناوی"بارەگای شیعر"ەکەنازانملەبەرچی ناوتان لێ گۆڕیوەوکردووتانە بە"شیعرچیە"؟! کەلەگەڵ نێوەرۆکی شیعرەکەباش ناگونجێ.

٣-دێڕێک لەشیعرەکەچاپ نەکراوەکەئەوەش بەلای منەوە وەکووبنیادەمێک دەچێ کە پیلێکی بڕابێ دێڕەکەش ئەوەیە :

"مەبەست وواتای کورت بێ یادرێژ بەرزبێ و جوان بێ"

★تاران: **کاک ج.ئاشتی**

لەلاپەڕی ٩٤ قسەی خۆش ، تانجی وکەروێشک ،دێڕی ٨ لەباتی "تانجی" نووسراوە "ڕێوی"

کەرەج :کاک **موحسینی سەدیقی**

★ لە ماموٚستاهەژاردا وا دەکەم بەسەرهات وژیاننامەی زانای مەزن خوالێ خۆشبوو دوکتور"محمد صدیق مفتی زادە" بۆسروە بنووسێ .

تەوریز :کاک ا **.حەمیدی**

★چونکەزۆرتری نێوەرۆکی گۆوارەکەلەسەرشێوەی کوری ناوەندی یەوزوربەی خوێنەرانی گۆوارەکە بەو شێوەیە ئاشنان تکام ئەوەیە ئەگەرپارچەشیعرێک بە شێوەکانی دیکەی زمانی کوردی چاپ دەکەن ،مانای وشەنامۆکانی هەرلەبن ئەو لاپەڕەی شیعرەکەی تێدا نووسراوە ، بنووسن .

★لەماموٚستایانی ناسیاوی وردوەک نالی،مەحوی حاجی قادر،وەفایی، حەریق،گۆران هێمن ودەیان شاعیوی دیکەی کوردزۆرترشیعرچاپ کرێ .

تەورێز :کاک **فەرهادی ئێرانی**

★ بەبڕوای من باشترە خەتی عادەتی و کتێبی کەهەمخاناتروجوانترە و هەم هەموان زۆربەراحەتی سەرەندەری لێ دەکەن بە کاربەرن .

بانە :کاک **عوسمانی ئەسراری**

★پێشنیاردەکەمکەجوغرافیای تەبیعی ـ سیاسی ئابووری کوردستان بەنەقشەوەبڵاو بکەنەوە .

**سەقز :کاک حامیدی شافیعی**

★لەبەشی شیعری شاعیرانەدا یادێک لە سوارە و شیعرەکانی دەتوانێ نیشانەی بایەخ دانی سروە بەوشاعیرونووسەرە گەورە بێ کەهێشتا بۆزۆرکەس نەناسراوە تکایەبیناسێنن .

★لەگۆوارەکەدابەشی "لەگەڵ شیعری شاعیرانی لاو" بەڕاستی جوانە ئەگەردەکرێ لانی کەملا پەڕێک زیاتری بۆدانێن .

**پیرانشار :کاک محمدامین ئاگووشی**

★چونکە لەئێرانداکەمتر کوردی نووسراوە،هەوڵ بدەن بەزمانێکی سادەتر بنووسن .

★لەسەرژیانی خەڵکی ناوچەجۆراجۆرەکانی کوردستان بنووسن .

جەدوەلەکان ئاسانتر بن .

ئیسکی بەغدای بۆکان

**کاک رەشیدی حەبیبی فەڕ**

★ئەگەردەتوانن جوغرافیای کوردستان لە لاپەڕەیەکدا بەنەقشەوە بڵاو بکەنەوە .

★ئەگەردەکرێ سەرنج بدرێتە سەنعەت- کشت و کاڵ وبیهداشت .

**سەردەشت : کاک عبداللە حسن زادە**

★نووسەرانی سروە سەرنج بدەنە ئەم کەم و کووڕیانە وبۆ نەهێشتنیان هەنگاو هەڵێننەوە :

★پەیوەندی مێژوویی کورد و ئیسلام لەژێر سەردێڕی"ئیسلام وکورد" یا "ئیسلام لە کورستاندا " یا ...

★باسی تەفسیر حەدیث و شەریعەتی ئیسلام بەکورتی لەبەشی ئاینی گۆوارەکەدا .

★باسێک لەسەر وەزعی ئابووری ئێستا و رابردووی کوردستان و سەرچاوە تەبیعییەکانی ئابووری کوردستان .

★باسێک لەسەر لەهجەکانی زمانی کوردی و ناوبردنی ئەو لەهجانە .

★باسێکی تایبەتی بۆ ژنان و گیروگرفتەکانی ئەوان لە ژیانی کۆمەلایەتیدا .

★باس لەسەر داب ورەسمە کۆمەلایەتییەکانی هەر ناوچە-یەکی کوردستان .

**نەغەدە :کاک دیاری مەحموود غەنوری**

★گۆوارەکەوێنەی کەمە بەتایبەتی وێنەی دیمەنی کوردستان وئەوچەندوینەش کەتێیدا یەرەش وسپی ین ئەگەررەنگی بایە زۆر زۆر باشتردەبوو .

★لاپەڕەیەکی تایبەتی دانێن بۆوێنە .

★چیرۆکی درێژبنووسن .

**رەوانسەر :کاک بەهرامی محەممەدی**

★نووسەرانی سروە تێ بکۆشن بەشیعروچیرۆک و شێوەکانی تری نووسین رەخنە لەداب ورەسمەنالەبارە کۆمەلایەتیەکان بگرن.بۆ وێنەلەسەرژن بەمێرددان لە ناوچەی هەورامان وشوێنەکانی دیکەی کوردستان بنووسن .

چون هێندێک دایک وباب بڕو بیانوویەکی زۆردەگرن و دەبنە هۆی بەئاوات و ئامانج نەگەیشتنی کوڕ و کچەکانیان. ئەم خوێنەرە بەڕێزانەش رەخنەو پێشنیاری جوان و بە کەلکیان بۆ ناردووین .

زۆریان لەبەر ئەوەی لە رەخنە بڵاو کراوەکانیشدا هەبوون دووپاتکردنەوەیمان بەپێویست نەزانی . زۆریشیان بەکەلک بوون وکەلکمان لێ وەرگرتوون لێرە دا ناوی ئەوئازیزانە دەنووسین :

● **بانە :** کاک تاها قادرکانی سپیکەیی . **پیرانشار :**کاک محەممەد ئەمینی عبداللەزادە **گوندی تازەکەندی مەهاباد :** کاک کەریمی رەسووڵی **نەغەدە :** کاک جەببارخۆشناو **سەقز :** کاک ئەنوەری مەعرەفەت **.گوندی چەپەراوێی شنۆ :**مامۆستا مەلاعبداللە میهەنپور . **شنۆ :**کاک سمایل عبداللە . **تەورێز :** کاک تاها فەیزی زادە **.مەهاباد:** کاک مستەفا دادار .

نووسینی
عبدالخالق خداجوی قرنی

ئەوەی ئاشکرایە لێکۆڵینەوەی وەزعی ولاتێک زۆر لە لێکۆڵینەوە و تەحقیق لەسەر شارستان یا ناوچەیەکی بچووکی وەک سەقز هاسانترە. چونکە ولاتێکی بە درێژایی مێژوو ناوبانگ و مەوقیعیەتێکی تایبەتی بووە، حەتمەن خاوەنی جوغرافیا و مێژوویەکی نووسراو (مدون)ە کە تامەزرۆیی ئەهلی تەحقیقی کەم تا زۆر پێدەشکێ. لە لایەکی تریشەوە موتالەعەی جوغرافیا و مێژووی دراوسێکانی ولاتێکی وا، هەندێک زانینی تر، لەبارەی ئەم ولاتەوە روون دەکاتەوە.

کوسپێکی سەر رێگەی نووسینی وتارەکە تا رادەیەک ئەوزاعی جوغرافیایی سەقز پیشان دەدا، نەبوونی کتێبێکی سەربەخۆیە دەبارەی سەقز بەم حالەشەوە من پرس و رام بە دۆست و ئاشنایان کرد و چەند رۆژانیش لە کتێبخانەکان خەریک بووم و توانیم ئەم چەند لاپەڕەیە بە هاونیشتمانان بەتایبەتی هاوشاریەسەقزیەکانم پێشکێش بکەم.

هەرچەندە ئەم بەرهەمە لە عەیب و ئیراد بەدوور نیە بەڵام هەنگاوێکە لە رێگایەکی دیاری کراودا، ئەگەر ئیدارەی ئاموزش و پەروەرشی سەقز و موحەقیقەکانی ئاموزش و پەروەرشی کول رازی بن و هەندێکم سەرچاوەی زۆرتر لە ئیختیار بنێن، دەتوانم لە سایەی زانایان و بیر و ڕای ئەوان و ئەو سەرچاوە کۆنانەی لە کتێبخانەکانی تاران زۆرن، نووسراوێکی پوخت و پاراوتر پێشکێشی ئینقلابی بەشکۆی ئیسلامی بکەم.

**سەرگرۆی جوغرافیای سەقز**

**"عبدالخالق خداجوی قرنی"**

وەزعی تەبیعی :

شارستانی سەقز لە باکووری کوردستان، لە بەرزایی ۱۸۳۳ میتر لە توولی جوغرافیایی ۴۶ دەرەجە و ۱۵ دەقیقە و عەرزی ۳۳ دەرەجەدا هەڵکەوتووە. شاری سەقز بەسەر دوو تەپۆڵکەوەیە و چەمێک هەر بەم ناوە بە تەنیشتیدا تێدەپەڕێ، ئەم تەپۆڵکە ئامالْ درێژانە کە چەمێکی بچووک بەناوی **(ولێ خان)** درێژاودرێژ لێکیان هەڵدەبڕێ دیمەنی جۆر بەجۆر یان داوە بەم شارە، بە چەشنێکی زوربەی شوێنەکانی نێو شار و کۆڵانەکانی، ناڕێکە و تەپکەکان بوونەتە هۆی سەرەوژێری یا سەرەوژووریان ئەم ناهەمواریە ئەوەندەی کار کردۆتە سەر دروستکردنی خانووبەرەکان ئەگەر لەدوورەوە بڕوانینە رووکاری شارەکە، خانووبەرەکان وەک پلیکان بەسەر یەکترەوە دەبینرێن. رێبوارێکی لە دەرەوە دێتە نێو شار، دووراودوور دیمەنی لێک جیاواز دەبینێ کە

ئەویش بەستە بەوەیە لە کا ملارا بێ چونکە دوورە- دیمەنەکانی شار لەبەر ئەو مەوقیعیەتەی هەیەتی بە پێی جیهەتەکان لێک جیاوازن ،بە تایبەتی شەوانە کە چرا دایسێنن دیمەنی شار لە دوورەوە بۆ ئەو رێبوارەی لە لای بانەوە دێتە سەقز جوان و دلڕفێنە .

سەقز ناوچەیەکی کوێستانە. هەواکەی زستانان زۆر ساردە و هاوینان گەرمە .زستانان جاری وایە بەفر زۆر ئەستوور دەکەوێ و پایز و بەهارانیش زیاتر چەند رۆژان بێ‌نێوبر باران دەبارێ،دەور و بەری ئەم شارە چیای بەناوبانگی ئەوتۆی لێ نیە بەلام هێندێک بەرزایی دەورەیان داوە ،ئی هەرە گرینگیان کێوەکانی ((هیجانان))ە .

سەقز لە یەکەمین یەکیتی- یەکەی قەومی ماددا (ئیزیرتام) یان پێ گوتووە و پێتەختی ماددەکان بووە سەرکردە ماددەکان هێندێک شوێنی قایمیان بۆ خۆیان ساز کردووە ، **زێویەی** ئێستا و (**ئارامائیت**)قەپلانتووی ئێستا لەوانن . ئەو زەمان (**سارگن**)ی دووەمی پاتشای ئاشوور پەلاماری مەلبەندی ماددەکانی داوئیزیرتا وزێویە و ئاراماڤیتی وێران کرد و ماددەکان تێک شکان و پەڕیوەی لای هەمەدان بوون .

پاشان (**سەکا**)کان هاتنە ئەم شارە و ئاوەدانیان کردەوە و بە سەقزیان بەناوی (**ئیسکیپتس**) (ساکز) بە پێتەختی خۆیان هەلبژارد وناوی "**سەکە**" ، ئیسکیت = **سەگز= سەکز= سەقز** لە **ساکزی** ئەودەم کەوتۆتەوە

لەئیکتیشافاتی گردی **زێویەدا** هێندێک ئاساری کۆنینەی وەک دەوریەیە کی پیرۆزەی لاجیوەردی کە ئی ٧٠٠ سال پێش میلادە وهێندێک بینای دووسێ نهوم وزۆر شتی تر دۆزراونەوە.لە نێوەندی شار بەسەر گردێکەوە شوێنەواری قەلایەک ماوە کە ئی زەمانی‌شەڕی ئێران و عوسمانی یە و ئەوان سازیان کردووە ،جگە لەقەلای ناوبراو کاولەکانی گوندی **زێویەی** ئەم شارە و ئەشکەوتی (**کەرەفتوو**)ش بۆ باسکردن دەبن چونکە نیشانەی کۆنی و تەمەددونی ئەم ناوچەیەن ،بە رای هێندێک کەس‌ئەشکەوتی کەرەفتوو یەکێک لە **مەعبەدە** **مەشهوورەکانی** زەمانی **باستانە**

زارکی ئەشکەوتی **کەرەفتوو** کە قەلایەکی دەسکردە ٣٥**میتر** لە ئاستی زەوی بەرزترە **و** ئاسەواری ئەو پلیکانانەی قەدیم پێیدا چوونەتە **نێو** ئەشکەوتەکە هێشتا ماوە . بەرەوەی ئەشکەوتەکە دالانێکی درێژی دەسکردە کەزۆر لێک **و** لووسە و چەند وەتاغی **تێدایە** گەلێکیان تاقەی گەورە **و** بچووک هەیە و لە **نێو** دالانەکەشدا گەلە تەندوورێک تایبەتی‌یەوەبەدی

دەکرێن ، چەند ڕێگایەک ئەم داڵانە بە داڵانێکی درێژترەوە دەنووسێنێ کە کۆمەڵە ڕێگایەکی بەسامی لێ دەبێتەوە .لەنهۆمی سێیەمی ئەم ئەشکەوتەدا زۆر دیو داتاشراون شوێنەواری پێشینان وهێندێک نووسراوی خەتی بزماریان تێدا بەرچاو دەکەوێ ،لە دیوی پێنجەمدا ناوی (کازالۆف)ی ، رۆژهەڵاتناسی رووسی هەڵکەندراوە کە ساڵی ١٩١٧ سەری ئەو شوێنەی داوە ، نێو ئەشکەوتەکە چەمێکی بچووکی پێدا دەڕوا ،ئەمچەمەکۆمەڵێکی ئاوهەڵدێر پێک هێناوە ، دوو ئەستێریش لە ئەشکەوتەکەدا دروست کراون ئاوی یەکیان شیرینە و ئی ئەوی تریان سوێر و ناخۆش.ئەشکەوتی کەرەفتو لەمەڵبەندی (هۆبەتووی سەقز و ٢٦ کیلومیتری تیکاب و قەراخ جادەی "سەقزبۆسنە" هەڵکەوتووە.دەربارەی کاولەکانی گوندی زێویە کە ٥٨کیلومیتر لە سەقز دوورە ،دەبێ بڵێین لەم دوایی یانەدا شوان خەزێنەیەکی زێر و زێو و برۆنزیان لەم شوێنە دۆزیوەتەوە کە سەرنجی باستان ناسانی ڕاکێشا. دەستیان کرد بە هەڵکۆڵین و خانووبەرەیەکی خشتی سوور و بەردی تاشراو بەچەند وەتاغەوە دەرکەوت ، هەروەها هێندێک دەفر وسواڵەت بە شکلی جۆربەجۆری وەک باڵندە

کێوی زێویە

و... دیتراوە ورای مامۆستای رەحمتی، **رەشیدی یاسمی** وە راست گێڕا کە ساڵی ٨٣٥ ی ، پێش میلاد پاتشاکانی ئاشوور ئیستیحکاماتیان لە دەور و بەری وێ دروست کردووە (١) ئاسەواری بینا گەورەکانی ئەم شوێنە لەسەر گردێکە ١٥٠٠ میتر بەرزە٠ وێ هەڵگەڕانی هاسان نیە بەتایبەتی داوێنی جنووبی گردە کە ئەشکەوتێکی لێیە ئەگەرچەند کەسێک بچنە بەر زارکەکەی دەتوانن پێشی دەستەیەکی زۆر بگرن و نەیەڵن وەسەرگردەکە بکەوێ. تائێستا لە زارکی ئەشکەوتەکەدا ٦٥ گۆڕ دیتراونەوە مردووی نێو ئەم گۆڕانە بە حوکمی ڕێ وشوێن وبیر وباوەریان شت و مەکی بەنرخیان لەگەڵ نێژراوە ، هێندێک شتی بایی دار وەک ملوانکە و بازنە و گوارە و سینەڕیزی زێڕ وشیر و تیر و کەوان و مەتاڵ و زین ، کە دۆزراونەوە لەو گۆڕانە دا بوون ٠ **کۆڕی زانستگای پینسیلوانیای ئامریکا** بە تەحقیق و هەڵکۆڵین ئاسەواری پلیکانیکی گەورەی دۆزیوەتەوە ،لە داوێنی رۆژاوای گردەکەڕا چووەتە نێو بیناکە ،هەروەها وەتاغێکی رەنگ کراو و دەروازەیەکی بەردینە و ئاسەواری مەنجەنیقێک بە بەردەگوللەی خۆیەوە ،دەچەند ڕیزی ئەو شتانەی بە ، هەڵکۆڵین دۆزراونەتەوە ٠

**گەڕەکەکانی سەقز**

سەقز لە گەرەکە کۆنی "ناوقەلا" و "چنارستان" و

خدیابان و "سەرقەبران" و "سەر پەچە" و "ناوچەم"وکازم ـ خان"پێک هاتووە . لەم دوایی یانەدا گەرەکی "بەهارستان"و"شەریف ئاوا" و سیلۆو کەریم ئاوا و"گەڕەکی سیلۆو بلوار"و"جووتیاران" و بەردبڕان و"مەنبەعی ئاو کوشتارگا"ی لێ زیاد بووە.

**هەوای مەڵبەندی کوردستان**

هەموو تایبەتەکانی ئیقلیمی کوێستان لەم هەرێمە هەیە ، هاوینی گەرم و بەتین و زستانی سارد و بەستەڵەک لە تایبەتەکانی ئاو و هەوای کوردستانن. دەرەجەی گەرمایی بەلانی زۆرەوە ئەغلەب تا (٣٨/٥ ) دەرەجەی سانتیگراد هەڵدە- کشێ جاری وایە لەویش بەرە ژوورتر دەچێ بەلانی کەمەوە دەرەجەی گەرمایی ساڵانە زۆر جاران تا (٢٠ ) دێتە خوار ، نابێ لە بیرمان بچێ ئەم ژمارانە مامناوەندی لانی کەمی چوار ساڵانن لە سەقز باران زۆرتر مانگی خاکەلێوە و خەزەڵوەر ، دەبارێ .

**چۆمەکان**

**قزڵ ئەوزەن (قزڵ وەزان) :**

سەرچاوەی قزڵ وەزان لە بەرزایی یەکانی بەپیت و بەرەکەت و پڕ بەفری **چل چەمەی** کوردستانە وپاشان ، بەرەو رۆژهەڵات دەڕوا و بە ناوچەی**قەرەتەوەرەدا**تێدەپەڕێ و دەچێتە ناوچەی گەڕووس، چەمی(**گەڕووس**)کە لە چیاکانی **پەنجەعەلی** باکووری رۆژاوای هەمەدانەوە دێتەخوار لە لای راستەوە رەگەڵی دەکەوێ ، پاشان تا **دەریای خەزەر** بە رێبازی خۆیدا دەڕوا. درێژایی **قزڵ وەزان** لە سەرچاوەڕا تا **مەنجیل** نیزیکەی ٥٠٠ کیلۆمیترە و ٥٠٠٠٠ کیلۆمیتری چوارگۆشە زەمینی دەبەردایە . ، مەوقیعیەتە جوغرافیایی یەکەی لە ئیستگای **ئستووردا** ٧٣ دەرەجە و ٢٦ دەقیقەی بەرینایی باکوور (عەرزی شیمال و ٤٧ دەرەجە و ٥١ دەقیقەی درێژایی رۆژهەڵات (توولی شەرق)ە . ئاوەکەی لەم ئیستگایە ٥ تا ٥٥ میتری موکەعەب قووڵە .

**پێشینەی مێژوویی چەمی قزڵ- وەزان**

بەنووسراوەکانی رابردوو و کتێبە جوغرافیاکانی ئەم سەردەمە وا دەردەکەوێ لە دەوروبەری سەدەی نۆیەمی میلادی یانی هاتنەسەرکاری سەفەوییەکان ناوی چەمە **(اسپیذ رود)** ، **(سفید جوی) سپید رود** ، **(سفیدرود)** بووە بەڵام وێڕای وەباوکەوتنی وشەی **قزڵباش** ،ناوی چەمەکەش لە کتێب وسەرچاوەکانی ئەو دەورەدا بە **قزڵ وەزان** هاتووە

**زێرینە چەم (جەغەتوو) :**

زێڕینە چەم لەداوێنی رۆژهەڵاتی کێوەکانی چل چەمەی کوردستان سەرچاوە دەگرێ و بەهەندێک دەرەی قووڵ وپێچاو پێچدا دەڕوا ولە سەرەتای رێبازەکەیدا بەناوی **خوڕخوڕە** لەچیاکانی **(حاجی سەیدهەلۆکۆ)** دێتە خوار وپاش بڕینی مەودایەک رێگەی "**سەقز بۆ سنە**"دەکا بە دوو کەرت و بە گوندی **نمەینەدا** دەڕوا لەوێوە لقی ئەسڵی جەغەتووی تێکەڵ دەبێ و هەر بەناوی جەغەتوو درێژە بە رێبازی خۆی دەدا لە رێگادا چەمی **سارۆخی**

دێته گەڵ و بەرەو باکووری ڕۆژاوا پێچ دەکاتەوە و بە گوندی "سارۆقامیش" و مەحموود ئاوادا ڕادەبرێ لەو جێگایە چەمی (**قەورە**)شی دێتە سەر و جیهەتی ڕێبازەکەی دەگۆڕێ بە **سایین قەڵا**دا دەڕوا ولەسەر ڕێگەی خۆی بە گوندی **داشکەند و ئەحمەدئاوا** و و **وسێن ئاوادا** ڕادەبڕێ و چەند لقێکی وەک **ئەجیرلوو**، چەمی **قۆری چای** تێکەڵی دەبن و درێژە بە ڕەوتەکەی دەدا پاش هەڵبواردنی مەوادیەکی تر بە ڕۆژهەڵاتی شاری **میاندوا**وتێدەپەڕێ . بەراوی **جەخەتوو** یا **زێڕینە چەم** لە ناوچەی **یەمین ئاوا** نزیکەی ٦٧٨٠ کیلۆمیتری چوار گۆشەیە و ئەندازەی مام ناوەندی ئاوی سالانە لەم شوێنە لە ١٢٨١ میلیۆن میتری موکەعەب زۆرترە چەمی **جەخەتوو** دوای ئیجاد کردنی (دیلتا) یەکی بەرین کە هەمووی قوڕ ولیتە ولیمە دەڕژێتە دەریاچەیورمێ

## چەمی سەقز

لە کێوەکانی خان کە بەشێکی زنجیرە چیاکانی **بەردەسوورن** سەرچاوە دەگرێ و لە**جنووبی ڕۆژاوا**وە تا باکووری ڕۆژهەڵات هەموو شاری **سەقز** پاراو دەکاو لە نزیک (**داش ئاعلووجە**)وە تێکەڵ بە **جەغەتوو** دەبێ . چەمە چکۆلەکەی (**وڵیخان**)یش لە

کێوەکانیئاڵماڵوو سەرچاوە دەگری وبەنێوەندی **سەقز**دا دەڕوا وتێکەڵ بە چەمی سەقز دەبێ و دەچێتەوە سەر**جەخەتوو**.

**تاتائوو یا تەتەهوو :**

چەمی **تەتەهوو** کە پێشان ناوی **تاتاعوو** بووەوتە**غەتوو** شیان پێگوتووە لەمانگی ڕەزبەری ١٣١٦ شەمسیدا **فەرهەنگستانی ئیران** ناوی ناوە (**سیمینەرود**) ئەمچەمە لە چیای**برایم جەلال و نەستان** سەرچاوە دەگرێ گەلێک لقی لە **تورجان** و **ئیسکی بەغدا** و **کەرێزەی ئەییووبی** ، دەچێتەوە سەر و بەلای ڕۆژاوای بۆکاندا دەڕۆاو لە سەر ڕێگای خۆی هێندێک لقی تر لە لای ڕۆژاوا لە شوێنی **تازەقەڵاو عیساکەند** تێکەڵی دەبن ، پاشان بە گوندی **حوسێن ئاوا و حاجی ئاوا** و **ئوزون قشلاخدا** ڕادەبرێ و شان بەشانی **زێڕینە چەم** دەڕواو دەچێتە نێو جولگەی ڕۆژاوای **میاندوا**و، **زێونیە چەم(سیمینە روود)**، لەچاو زەوی وزاری دەوروبەری خۆی نزمە.ڕادەی ئاوەکەی ، کەلە داشبەند (شەش کیلومیتر لە میاندواو دوورەو لەسەرڕێگەی سەقزە) دە پێون سالانە بە مام ناوەندی ٦٤٠ میلیۆن میتری موکەعەبە . بەراوەکەی تەقریبەن ٢٠٩٠ کیلومیتری چوارگۆشەیە و لە کیلومیترێکی چوارگوشەدا هەرسانیەیەک نزیک بە ٩/٦٧ لیتر ئاودەدا (دێبی)ی ئاوی تەتەهوو لە هەرەتی بێ ئاویدا ، بەسانیەیەک لە میترێکی موکەعەب کەمترە .

**تایبەتەکانی سەددی زێڕینە چەم :**

خاکی سەددەکە گڵەسوورە و

ئاوەکە هەڵنامژێ .درێژایی تاجەکەی دەگەڵ بەرزایی ٥٠ میترە . بەرینایی تاجەکە ٢٠ میترە و زەرفیەتی دەریاچەکە ٦٥٠ میلیون میتری موکەعەبە و سەتحی دەریاچەی سەدەکە ٤٥٠٠ هیکتارە .تەنبو (توربین)ەکانی تەولیدی بەرق بەشێوەی ١٠/٠٠٠ کیلۆ وات ، کەلکیان لێ وەردەگیرێ .

ئاوی بەردراوی سەددی زەخیرەی زێڕینەچەم پاش بڕینی حەفتا کیلۆمیتر بە بەستێنی زێڕینە چەمدا ، بەسەددێکی ئینحیرافی حەواڵەی سەرئاوایی یەکانی ئەم بەرئەو بەردەکرێ و نزیک بە ٨٥٠٠ هیکتار زەوی پاراودەکا

**مەوقیعیەت وتایبەتەکانی سەددەکە :**

سەددی مەخزەنی **زێرینە چەم** لە گوندی **یەمین ئاوا** ،بە مەودای ٨٥کیلومیتر ،لە جەنووبی رۆژاوای **میاندواو** ، هەڵکەوتووە تایبەتەکانی **زێڕینەچەم** بەم جۆرەیە :

**نەوعی سەددەکە : گڵ یا گڵە سوور کە ئاوهەڵنامژێ**

**بەرزایی : ٥٠میتر**

**درێژایی تاجیسەددەکە : ٢٠ میتر**

**پانایی تاجی سەددەکە : ١٠ میتر**

**پانایی سەددەکە لە میحوەری چۆمەکەدا : ١٤٥میتر**

**زەرفیەتی دەریاچەکە : ٦٥٠ میلیون میتری موکەعەب**

**زەرفیەتی بەکەلکی دەریاچەکە: ٤٨٦میلیۆن میتری موکەعەب**

بەلای راستی سەددەوە بپنایەکی بیتۆن سازکراوەتا کاتی لافاو زێدەئاوەکە بەودا کەلاو بکا ئەم بینایە ١٥٠ میتر درێژە ودەتوانێ سیلاوێک بە حەجمی ٤٣٠٠١ میتری موکەعەبەوە ، ببوێرێ بە بەری چەپیشەوە ئاوگری بۆ دیاری کراوە ئەم برجە دەریچەی تەنزیم و راگوێستنی هەن، ئاو بەم دەریچانەدا ،بە تەوژم و ئەوشارێکی زۆر دەچێتە نێو دوو تونیل.قوتری ئەم تونیلانە ٥میترە و ٢٣٠میتریش درێژن و وایان داناوە پاش تەواو بوونی ساختمانەکە بۆ وەکار خستنی تەنبووی ١٠/٠٠٠کیلۆ واتی بەرق کەلکیان لێ وەربگیرێ .

**ئەو کەرەستانەی بیناکەیان لێ ساز کراوە :**

**١ ـ بیتۆن ٩١٠٠٠میتری مەکەعەب**

**٢ ـ گڵەسوور وبەردوخیز ، ١٩٠٠/٠٠٠میتری موکەعەب .**

**( دریژەی هەیە )**

# سەرەخۆشی

هەر هونەر نەمر و هونەروەر مەرد ورەند

دیسان ریحانەیەکی دوورە دێراوی گوڵزاری ئەدەب و فەرهەنگی نەتەوایەتی پرووکا . دیسان گەنجینەیەکی بایەخداری دارماڵی هونەر کەوتە باوەشی سارد و سڕی خاک .

حەمەدی بەیتان ( محمد غزالی ) دەنگخۆش و بەیت بێژی بەناو بانگ لە نێومان رۆیی . ئینتیشاراتی صلاح‌الدینی ئەییووبی ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی وێڕای داخ و پەژارەیەکی زۆر سەرەخوشی لە نەتەوەی کورد بەتایبەتی لە بنەماڵەی ئەم هونەرمەندە نەمرە دەکا هیوا دارین بتوانین لە ژمارەکانی .داهاتوو دا کورتەیەک لە ژیانی ئەم هونەروەرە پایە بەرزەتان پێشکەش بکەین

ئەدەبی

فۆلکلۆری

کوردی

# ... پایـــزە ...

ئەی وای وای وای وای وای، !

ئەوە سەودایەکی دەپیرە پایزێ ،

لەسەری منی ماڵ وێرانی دەداوە .

دەک نەمێنم چ پایزێکە !

سەر لە زستانێ .

کیژ دەڵێ دەترسێم پەڵە بارانێکی،

بەڕەحمەت لەمن ببارێ .

بداڵ لە عێسقان لە فەلاسقان .

ران و رکێفی دەعارەب و عارەبە سواران،

بدا لە گوێی دە کەمبەرێ ،

بشکێنێ جووتکاریتەی دەرەشە ریحانێ ،

کوڕ دەڵێ قەول و قەرارێ خۆم ،

دەگەڵ گراویلکێ دەبەست ،

ئەوێ محەلێ بەهارێ،

کەماڵ پێ دەچوونە کوێستانێ ،

ئەلحانە کانە ئەوە پیرە پایزە،

خەزلۆوە رێنە خێڵ سەربەرەو ژێرە ،

لەمن هاتۆتەوە محەلی دەدەست لێک بەردانێ

ئەی سەرگەردان و دەست لێک بەردانی ،

دەوان شەو دەشلانم ،

هەی نەمێنم لەبەر ئەوێ پایزێ ،

ئەی وای وای وای وای وای !

ئەوە سەودایەکی دەپیرە پایزێ ،

لەسەری منی ماڵ وێرانی دەداوە ،

دەک نەمێنم چ پایزە ،

لاڵ بم درەنگم پێ زانی ،

ئەوە لە بنی گوێیانم خۆش دێ ،

دەنگی بازێ شەهێنێ ، شمقارێ ،

هەڵە تانج و شالووران ،

ئەمما رەحەدەحەدی نیوەشەوێدا ،

لەبنی گوێیانم دێ ،

چریکەی دەپیرە تەڕلانی ،

کور ـ دەڵێ شینکێ مات و مەلوولم دەدی
لەبەر هەیهاتی سواران،پڕمەی دەکەحێلان ،
شەقەی دەئاوزەنگیان، بۆنی دە دەرمانی ،
ئەوە شیرین غەمزەیەکی رێ دەنیشت ،
تەمبوورەی دەکرد
ئەما خۆی لەمن داویشتەوە ،
مەرقەدەکەی دە بداخ سولتانی ،
بە خودای خوشە ،
دۆستێکی بە بەقا و مەتمانەت بێ ،
...............................
...............................
...............................
...............................
ئەی سەرگەردان و دەست لێک بەردانی ،
دەوان شەدە شلانم ،
هەی نەمێنم لەبەر ئەوێ پایزێ ،
ئەی وای وای وای وای وای !
ئەوە سەودایەکی دەپیرە پایزێ ،
لەسەری منی ماڵ وێرانی دەداوە ،
دەک نە مێنم ، بەحام گەلاوێژ لەمن دەیزوێ

دەڵێم کوڕینە سەردەمێکی بۆ خۆ راوچی بووم
ئەوە سەیدە راوی خۆم دەکرد لەقووچی قەزەنێ،
لە دەشتی رەواندوزێ ،لە بۆڵە بەرانان ،
لە هەوارە میرێ ،لە سەرسپی رێزی غەیلانیان،
ناوەڵڵا لە بنەی دە قەڵادزێ ،
هەڵم دەستاندەوە شینکێ مات و مەلوول،
لە دامێنی دە خووسان ،
ئەوە جووتێکم تاجیلەی جووت قەڵاتی کەلەزراو
بەر دەدانێ ،
هەر دەیانگرت و دەیان داوە لە گەردالـــی
دەتـۆزێ .
دەڵێم کوڕینە هەر کەسانێکی ناز داری منـــی
نەدیوە ،
ئەگەر دەهات و رادەبرد ،
لە بۆ پاییزە هەواری ،
ئەوە حاجی دەگێڕانەوە لە رێی حیجازێ ،
سۆفی بەرماڵ بەشانی دەگێڕانەوە لە نوێژێ
ئەی سەرگەردان و دەست لێک بەردانی ،
دەوان شە دە شلانم ،
دەک نەمێنم لەبەر ئەوێ پایزێ !
ئەی وای وای وای وای !
ئەوە سەودایەکی پیرە پایزێ ،
لەسەری منی ماڵ وێرانی داوە ،
دەک نەمێنم ،
هەوران دێنێ گەوالان دەگێڕێ ،
هورەی هەڵدەدا ، تەندووران دەدا ،
بە بەر دێدا
ئەمن ئەوە سەیرێ خۆم دەدایەوە ،
تیرەگی دە کوێستانێ ،
سەریان دێنا دەرێ لەبن کەویلکە کەویلکەی
دە بەفری
پنجی سوێسنێ،هەڵاڵێ ، بەیبوونێ،سوورەگوڵێ ،
ناوەڵڵا بە عام دەگەڵ گوڵی گیابەند و خاوێ،
خۆیان رادەوەشاند ،
لەبەر سەحەر یەکەی بەری بەیانی ،
هەتا بارانی پەلەیان بە رەحمەت لێدا ،
ئەمن ئەوە زەینێ خۆم دەدایەوە ،

ئەوێ کەڵەگەتێ زەرد ئەسمەرێ ،
راوەستابوو لە دەرکی دە مەزنە ماڵێ،
پارچەمی دە خورمایی پەرێشان دەکردن ،
دەهاتنە خوارێ بەسەر خاڵی دەگەردنێدا ،
سەرگەردان و دەست لێک بەردانی ،
دەوان شەدە شلانم ،
هەی نەمێنم لەبەر ئەوێ پایزێ ،
ئەی وای وای وای وای وای !
ئەو سەودایەکی دە پیرە پایزێ ،
لەسەری منی ماڵ وێرانی دەداوە ،
دەک نەمێنم !
چەند پایزێکی لەمن بە مێجێزە ،
ئەمن زەینێ خۆم دەدایە تیرەگی دە کوێستانان،
سەریان دێنا وەدەرێ ،
لەبن کەویلکە کەویلکەی بەفری ،
پنجی سوێسنێ ،هەڵاڵێ،بەیبوونێ،گیا خاوێ،
وەنەوشەی دە ساوا لە منیان دەگرت رێزە ،
ئەمن ئەوا زەینی خۆم دەدایە مەڕ و ماڵی
حەمە ئاغای کۆیە ،
عێلی مەحموود بەگی سوورچی ،
دەهاتنە خوارێ لە پایزە هەواری ،
لە منی خانە وێرانێ غەزەڵیان دەدان پەرێزە،
ئەوە کیژ دەڵێ : هەتیوەخانە وێرانە ،
..............................
..............................
..............................
..............................
ئەی سەرگەردان و دەس لێک بەردانی ،
دەوان شەدە شلانم ،
دەک نەمێنم لەبەر ئەوێ پایزێ !
ئەی وای وای وای وای !
ئەوە سەودایەکی دە پیرە پایزێ ،
لەسەری منی ماڵ وێرانی دەداوە ،
دەک نەمێنم چەندە پایزێکی لە من سەر
لە هەوەڵێ ،
ئەمن زەینێ خۆم دەدایە تیرەگی دەکوێستانێ
سەریان دێناوە دەرێ لەبن کەویلکە کەویلکەی
دە بەفرێ ،
پنجی سوێسنێ ،هەڵاڵێ ،بەیبوونێ،گیا خاوێ،
وەنەوشەی دە ساوا لە منیان دەکرد پەلە
پەلێ ، ،
هەتا بە حوکمی خوداوەندی میری مەزن ،
بە سەریان دادەرژا بارانی دە پەلێ ،
ئەمن زەینێ خوم دەدایە رەزی حەمە ئاغای
کۆیە ،
خاسە کەوی گەردن بە خاڵ ،
لەمن دەچۆوە سەر گوێی دەبەردێ ،
شینکێ مات و مەلوولو بەتاو و کەلە زراو ،
مات دە بۆوە لە بن غەزەلێ ،
ئەوە کور دەڵێ ئەمن چ بکەمێ ،
بو قاسیدیکی بەمەتمان ،
بینێرمە خزمەت کورتە کابانێ زەند بەبازن،
بزانم ماوەتەوە لەسەر قەول و قەراری ،
دە هەوەڵێ ،
ئەی سەرگەردان و دەس لێک بەردانی ،
دەوان شەدە شلانم ،
دەک نەمێنم لەبەر ئەوێ پایزێ !
ئەی وای وای وای وای وای !
ئەوە پایزێکم گەیوەتێ ،
هیندێکان دەڵێن زووە ،
هیندێکان دەڵێن درەنگە ،
بەڵان پایزە و لەمن بە بێرە بێرە ،
ئەمن ئەوە زەینێ خۆم دەداوە ،
کوێستانی دە عەزیم ،
کوێستانی دە سازگار و لەمن بە زنوێرە ،
زەینی خوم دەداوە ،
چیغ و چادر و رەشماڵی دە دەوڵەمەندان،
ئەوە بەژنێ باریکم بە چاو دەنگاوی ،
بە دەستی وەبوو گۆزێکی خاسەرەنگ ،
دە باوەشی دابوو کۆرپەی ساوا ،
بە زمانێکی گەلێک خۆش دەیگوت هاوێرە ،
ئەی سەرگەردان و دەس لێک بەردانی ،
دەوان شەدە شلانم ،
دەک نەمێنم لەبەر ئەوێ پاییزێ ،

سال درەنگ بوو، پایز داهات، زەوی رەنگی بزرکا ، شینائی نەما ، تینی هەتاو کەم بۆوە، رۆژچیان بە بەرەوە نەما ، شەو درێژ و درێژتر بوون، هەوا فێنک بوو ، رەز رندران ، مشتاخ هەڵخران ، بێستان لەبەر کەوتن ، برکە هەڵکێشران ، جێ تووتن شێو کرانەوە ، ئاویژە لە بەراو دەرچوون ، ئەستێر داریان لێ راکێشرا ، سەرچاوە قەوزەیان گرت ، بناوان هەڵدێران دەراوبۆگە و لێڵ بوون ، پاوان و هەڵەسوون پێخوست و بۆژە بوون ، پێورە وێنجە داس پەڕێن کران ، رەپستە کۆڵەپنج بوون ، ئەوەندە تیشەیان چەند پەلکە بوو، ساردە ـ کێڵ دوندووکەیان دا ، کاو گزرە لە کادێن کران ، کۆدە و پۆڵکە و نەرمە گیا لە تایە و گیشە دران ، تفاقی زستان داخرا ، دێم کێڵ بە هیوای بارانی بە رەحمەت و هەقە پەڵەی پایز دێمەکار و ئیشکەکەندیان داچاند ، جار جار هەوری سپی و تەنک بەدەم باوە بە پەلە بە ئاسماندا تێ پەڕین چەند پریشکی بلاویان وەراند ، دڵی شکارتە کێڵی بێ زەویان داخورپاند و ترسان نەوەکوو ئەوندووکە دەغڵەی ئاو مالان بۆیان داچاندون گەندە نێ بن و بەجارێک قووت براو و بێ سەڵا بکەونەوە ، دار و دەوەن خەزەڵیان دا ، مێرگ و چیمەن بێ دیمەن بوون ، لاپاڵی بژوێن بوونە رێچکە ،نواڵەی زەنوێر کاتۆر کران ، تەلان و بەندەن رووتانەوە، رووباری خورێن لە خورین کەوتن ، رێبواری خورێن لە تەنکاویان دا ، سوار بۆ بوار نەگەڕان، گیا بەرزە بوونە ئیشکەڵ، دڕوو بوونە نەشتەر، تیکان

بووتە پەیکان ، پێکولّ و کونجی بوونە بزمار و دەرزی و لەپێی گالە وەڕێنی پێخواس هەڵچوون و گردە نشینیان کرد ، بابردەڵە وەک لەشکری بەزیو و شکاو رەتێنرا ، خۆی بۆ نەگیراوە، بڵاو بوو ، پووش و پەڵاش وەک ترسە نۆک و دوورە پەرێزان خۆیان لە خوازەبایان گرت ، لە نەدیو و پەسیو و بوودڕ و گەندالان خزین ، هەوار خاڵی بوون ، چادر و چیغ پێچرانەوە ، سیپەک هەڵپەسێران، مەشکە بەرچیغیان تێهەڵکێشرا و لەبن میچی نیومالّی قورماوی نران ، دۆدانە و شیر مەشک لە خەرارە کۆنان پێچران و لەبەر هەیوان و بێلا بە سینگ داکران ، نیرەی بێ خێر هەڵاوەسران ، گوریس و پەتک هەڵوێزنران ، شەنگە بێری قۆڵچاغەیان داڕنی ، بووزەڵە و بەر بێنکەیان شانە وشان کرد ، جامی مەڕدۆش و گا دۆشکەیان لەبن پێڕک و هەرزالان ئاخنی ، بێژینگ و دەستاڕیان وەکار خست تا زمهەڕ بۆزستانێ دوور و درێژ گێژەو بکەن ، ساوار بهاڕن ، بروێش بەبا بکەن ، بۆ دراو لێ بکەن ، کاکی شوان کە لە کوێستانی مەزن و هەواری سازگار مەڕی لەچرگەن دەچەقاوە و دەمی دە لەوەڕی پر و تەڕ و ناسک دەنا و یەکی لە یەکی دەرنەدەچوو، بۆ خۆشی لەسەر بەردێک دادەنیشت و قامکی لە بلوێر دەبزاوت و ئەوی لێی دەدا لێی نەدەداوە ، و پاشای بەسەپانی خۆی نەدەگرت ، ئێستا بلوێری لە مالّ داناوە، چونکە مەڕی کوێستان کە لەنگ و لۆر و دەغەزداری تێدا نەماوە و بێچاوێنی بێ سمڕە و ساکەتەی دووگی دەڵێی لینگە دەستاڕە و پشتی گرێی لێ براوە ، کوا لە ئارانی قاقڕ و کڕاڕ دادەمەزرێ؟ و دەچەقێتەوە ؟ لە دەشتی کاکی بە کاکیدا پەڕ هەڵداوێ ، پەڕەم پەڕەم دەبێ ، هەر کرتکەی روو لە لا یەک دەکا ، شوان ئەگەر وەک ددانی ماریش بێ ، پێ راناگا پێشی بگرێ ، تێکی بکاتەوە ، مەڕی قەڵەو و ساغ لە ئارانی بێ لەوەڕ چۆن چێشتاوان مۆلّ دەخوا ، پالێنان کۆڕ دەبەستێ ، شێوە خواران رادەوەستێ و شەوێنان لە حەوشەدا گیر دەبێ ؟ شوان دەبێ چاوێکی ببێتە چوار چاو و خەو و خواردن لە خۆ حەرام بکا ، گورگی فێلباز و دز هەمیشە لە کەلێندایە ، شوان بخافلێنێ ، سەگ بخیچێنێ ،تا کەلاک بستێنێ کام مەڕی شاز و قەڵەوە بڕفێنێ و ئەگەر خودای نەخواستە شوان لەخەو بمێنێ و دەز بێنی نەگرتبێ مێگەل را بدا و یەکی نەهێلێ و هەمووی بخنکێنێ ، جا لەو حالەدا شوان کوا مەجالی هەیە لە بلوێر بتووڕێنێ و عالەمێک وەجۆش بێنێ ؟

سالان لەم وەرزەدا کە کاری دێهات کەم دەبوو، سواغ و پینە و پەرۆی بان و دەرک و دیواران تەواو دەبوو و ئاوردوو داخرا ، جەنگەی راوەتاژی دەهات راوەتاژی لەمێژە لە کوردستاندا باوە تا نیوەی دووەمی ئەم چەرخە زۆر بە دابو دەستوور دەکرا ، هەرچەند ئێستاش کەم تا

کورتێک ماوە ، بەڵام بەرەو نەمان دەچێ. دیارە هەر رێ و شوێنێک بەسەر چوو، ئەم وشە وزاراوە و ئامرازانەی پەیوەندیان بەم ری و شوێنەوە هەیە ، لەسەر زار و زمانان نامێنن و وردە وردە لەبیر دەچنەوە ، تەنیا لە بەیت و باواندا دەمێننەوە کە تێ گەیشتنیان بۆ بەرەی داهاتوو دژوار و ئەستەم و گرانە ، خۆ بە ناشوکری ناڵێم فەرهەنگ نووسێکی ئەوتۆمان نەبووە و قامووسێکی وامان نیە ئەم وشە و زاراوانەی تۆمار کردبێ و لە نەمان پاراستبێ ، ئەمرۆژانە بۆ نووسینی ئەم وتارە پەنام بۆ فەرهەنگی تاقانەی کوردی بە کوردی خاڵ برد، لەژێر وشەی راو و تانجی و تاژیدا شتی وای نووسیبوو کابرا گوتەنی : " ئەزی تێدا شەرمەزار بوومەوە ." بۆیە ویستم ئەوی لە بیرم ماوە ولێی دەزانم لەو بارەدا بنووسم تا قاموس نووسی دوارۆژمان کەلکی لێ وەربگرن و ئەو لاوانەی کە وەک من ئەدەبی فۆلکلۆریکی کوردی بەخەزێنەی زمان دەزانن سوودی لێ وەربگرن .

ـ تاژی ـ

تاژی یا تانجی و تاجی تۆرەمە سەگێکی درێژ ، باریک ، ناسک ، شووش و لەسەر لینگە پێستی تەنک و ئاماڵ رووتەیە ، جوان و ژیکەڵەیە ، گوتوویانە:" تاژی شازادەی سەگانە " توند و تۆڵە، باش لینگ دەدا و بە دەوامە و بەکەلکی راو دێ تاژی تا زەنگەی بەرزتر ، تەنگەی گورجتر کەفەڵی بڵێندتر ، پشتی راکشاوتر و ئاماڵ کوورتر، پەنجەی شووشتر، سەر و کەللە و دەم و لمبۆزی باریکتر و رەقتر و درێژتر بێ پەسندترە .

وەک هەموو تۆرمە سەگێک بە نێری دەڵێن گۆڵ و بە مێی دەگوترێ دێڵ، گۆڵ هەمیشە بۆ جووت بوون ئامادەیە، بەڵام دێڵ ساڵی جارێک یا دووجار وەبا دێ ، زۆر پێشتر نیشانەی وەبا هاتنی دیاری دەدا ، جا ئەگەر خاوەنەکەی بخوازێ زووتر با بگرێ باشتری تێر دەکا تا قەڵەو بێ و ئەگەر بە پێچەوانە نەیەوێ ئاوس بێ ئەوە لە ژوورێکی تاریکدا دەیبەستێتەوە تا لەڕ و لاواز بێ و لە با بچێتەوە . جووت بوونی تاژیش وەک هەموو جنسە سەگێک " پێوەروانی " پێ دەڵێن ، دێڵ و گۆڵ پێکەوە دەنووسێن و تا ماوەیەک لێک جوێ نابنەوە ، تەنانەت ئەگەر ئازاریشیان بدەن .

لە زمانی کوردیدا بە زایینی هەموو نینۆکدار و گواندارێک " جگە لە ماڵۆس کە سمدارە " دەڵێن ترەکین ـ لە شێرەوە تا مشک ـ رەنگە بۆیە بێ کە زۆریان بێچوو دەبێ. تاژیش و سەگیش لەوان هەڵناوێرن ، دەڵێن دێڵە تاژی بە حەفتا شەووڕۆژ دەترەکێ . بە وەندە تووتکەی بە زگێک دەبن دەڵێن کۆخێک ، دێڵێک لە سێ وە تا یازدە تووتک دەبینێ،دێڵە تاژی هەشت گوانی ئەم بەر ئەوبەری هەیە ، تووتکە تاژی لە پێشدا چاوی نووساوە ، و نابینێ ، پاش چەند رۆژ چاوی دەپشکوێ ، بە قسەی کۆنە راوکەران هەوەڵ تووتک و ئاخر تووتکی کۆخێک لە وانی دیکە باشتر دەردەچن ، تووتکە تاژی زوو فێرە تێکوشین خواردن دەبێ وئیتر

نیازی بە شیری دایک نامێنێ،دێڵە تاژی تەرەکیو پێویستە زۆر باش بەخێو بکرێ و تێر بێ ، دەنا زیانی خورۆ و ماڵانگەڕ دەبێ و پەکی راگرتنی دەکەوێ ، تووتک کە ژیوەڵە بوو ، گوجووکی پێ دەڵێن و لە خۆی یەوە فێری راوێچکە دەبێ،راوێچکە کردن تەمرینی رێکەوتن و راو فێربوونە. گوجووکێک بو ئەوانی دیکە هەڵدێ و ئەوی تریش رێی دەکەون ، راوکەری کۆن دەڵێن هەر گوجووکێک هەڵات دیارە لەخۆی رادەبینێ و بە گەورەییش لەوانی دیکە چێتر و خێراتر و بەکارتر دەبێ. گوجووکێک بە ساڵەوەختێک سونوو یا سونی دێتەوە و پێی دەڵێن شەک ، نیشانەی سون هاتنەوە ئەوەیە کە گول لە کاتی میزکردندا لاقی هەڵدێنێ ، پاش ساڵێک دەبێتە خەرت و ئەمجار تەمەنی بە خەرت حیساب دەکرێ. خێرایی و خوێرایەتی تاژی تا نەبێتە خەرت دیاری ناکا ، وا دەبێ شەک نۆرەش ناکا و کەچی بە خەرتی زۆر چێ دەبی و بە پێچەوانە شەکی خێرا خوێری دەردەچێ .

" تاژی شین خەزاڵ "

**ـ رەنگەکانی تاژی ـ**

تاژی رەنگی جۆر بەجۆری هەیە،سپی ، رەش ، سوور ، نەباتی، شین ، خەزاڵ ، بۆر ، تاڵە ، شڵە، خورمایی ، خەنەیی ، گورگی پڵینگی ، قەزوانی، بازوو، بۆز قاجی و بەڵەک ، رەشبەڵەک ، سوور بەڵەک ، و شین بەڵەک .

**دەنگەکانی تاژی ئەمانەن**

لووراندن، نووڕاندن ، قرووسکاندن ، قووڕاندن ، نووزاندن ، مڕاندن و ناسکاندن

**ـ سیفەتەکانی تاژی ـ**

چێ ، خێرا ، تیژ، پەل ، رەشکوژ ،خۆشڕست، بەدڕست ، هەرزە، قرخەمە رەس ، دەمسارد ، دەمگەرم ، بە هەڵم و بە دەوام .

تاژی بە کاری راوی ئاسک و کێوی و کەروێشک دێ ، چێترین و باشترین و بەکارترین تاژی ئاسک کوژە، من کوێستانیم و ئاسکیش لە دەشت و گەرمیان دەژی و لە راوە ئاسک شارەزا نیم . مامۆستا عەلای رەحمەتی لە کتێبی " کورد واری " دا کە دەزانن هەر عینوانەکەشی غەڵەتە و هەموو کوردێک دەڵێ " کوردەواری " باسی راوە ئاسک دەکا من بە نەزانی خۆمەوە بە دڵم نەبوو، پێم وابوو هەڵەی تێدایە، ئەمما پیرە بەگێکی جاف جارێک باسی راوە ئاسکی بۆ کردووم ئەوە بۆتان دەگێڕمەوە راست و درۆی، وەباڵ بەستۆی خۆی دەیگوت: زەمانی دەسەڵات و باوی بەگ و پاشاکانی جاف کە کۆچەر و رەوەند بوون باشترین تاژی و رەسەنترین ئەسپ لەنێو جافاندا هەبوو، لە موکریانیش ناوبانگی ئەسپی جافان بوو، ـ " رەنگبێ راست بێ چونکە لە عەرەبان نیزیکن و جنسە ئەسپی عەرەبیش لە دنیادا مەشهوورە ـ دەیگوت : " پاشاکان تیپە سوارێکی باشیان هەڵدەبژارد، تاژی یەکانیان وافێرکردبوو کە راویان دادەبەست رستەیان هەڵدەکێشا و تاژی خۆی داویتە پێشکوی سوار و و مات دەبوو، کە ئاسک هەڵدەهات سواران بەو ئەسپە خۆشبەز و بەکارانەوە دەیان رەتاند تا دەیانزانی شەکەت بووە ئەمجار تاژییەکانیان بەر دەدایە تا لە

بۆ راوە کێوی بە تاژی بەرەگە دەنێنەوە
کێوی کە لەم شاخەوە بچێتە شاخێکی تر
تیرەگ بەر نادا یانی بە جێگایەکدا
دەڕوا کە هەر دووک دیوی کێوی لێ دیار
بێ ، جا راوکەری شارەزا تیرەگێکی
رەچاو دەکەن و خاشارگەی لێ دروست
دەکەن ، ئەگەر گوێنی و گیابەرزەی لێ
هەبێ ، کۆختە یەکی دوومیتری یا کەمتر
ساز دەکەن و خۆیان تاژی یەکانیان لە
وێدا مەلاس دەدەن ، ئەگەر ئەوەیان بۆ
هەلوا وارشی بەرد دروست دەکەن ،کێوماڵ
بەریکی شاخ بە هەراوهوریا و تەق و رەق
و چەقە چەق دەتەقێنن تا حەیوان بترسێ
و بە تیرەگدا بپەریتەوە شاخی ئەوبەر و
لە بەرەگە هەڵەنگوێ . ئەگەر مەودای
نیوان دوو کیو بەرین بی لە دوو
جیگاوە بەرەگەی بو دەگرن . تا ئەگەر
تاژی پێشەوە .راستی بکەن بەسەر بەرەگەی
دووەمدا بکەوێ و رزگاری نەیە ، تاژی
قایم و بە هەڵم و فیلاوی نەبێ نەدەگاتە
کێوی و نە دەوێرێ خۆی لێدا ، بەران و
نێری قەیر دەس دەکەنەوە و بەگژ تاژیدا
دینەوە و بە شەقوْن تێی هەڵدەدەن و
بریندار ی دەکەن ، وا دەبێ دەشیتۆپێنن .
بەلام تاژی کە قیلاوی بوو ، هەر لە
پاشڕا لە کێوی رۆ دێ و کە بۆی هەڵکەوت ،
باتووی دەگرێ و برستی دەبڕێ ، راوکەر
دەڵێن هۆی ئەوەی تاژی دەگاتە کێوی
ئەوەیە کێوی لە هەلاتندا زۆر ئاوڕان
دەداتەوە و مەحتەل دەبی ، دەنا زۆر بەباز
و بردترە ، کێوی بە تەڵە و شتی دیکەش
دەگرن کە لێرەدا جێی باس نیە .

**نەخۆشیەکانی تاژی**

سەگ بایی ، شانەڕەقە ، ئەکگە ،سەبنێسی ،
هاری ، سووزەنەک .

**(درێژەی هەیە)**

خۆڵی دەگەوزاند ، هەموو راوکەرێک خەنجەری
دەبەر دابوو و کێردی دەبان و تیژی لە
لە دیوی ژووری خەنجەردا لە کالان
چەقاند بوو بەو کێردە سەری و کێردی
دەبان و تیژی لە دیوی ژووری زیادیە

خۆڵی دەگەوزاند ،هەموو راوکەرێک خەنجەری
دەبەر دابوو و کێردی دەبان وتیژی لە
دیوی ژووری خەنجەردا لە کالان چەقاند
بوو ، بەو کێردە سەری ئاسکیان دەبڕی و
رەفیسکەیان کون دەکردن و لەبەن سامورتە-
کەیان هەڵدەکێشا و بە تەریزەی ئەسپەوە
هەڵیانداوەسی .

کورد بە هەموو گیاندارێکی گواندار و
سمدار کە کەوی و رام نەبێ دەڵێ کێوی ،
لە کێوە سەرکەش و شاخە سەخت و رژد و
هەڵەم و زەردو ماهەکانی کوردستاندا
کێوی دەژین ، کە لە کێوی، گاکێوی، شوور
یەکجار کەم بوون و لەوانەیە رەگەزەیان
لەم حاڵەدا لە مەترسیدا بێ و هەر
نەمێنن و نەم بیستووە ئەوانە بە تاژی
راو بکرێن ، بیستووتانە کە کێوی
بەتایبەتی رۆژانە لەشاخی هەرەسەخت و
رەوەزی ئەستەم نابێتەوە ، دەڵێن هەر
جێگایەکی شاخ بارانی وێ بکەوێ کێویش
دەتوانی پێیدا بڕوا ، دیارە تاژی لە
جێگای وا کار ناکا .

## هاوار

چەند ڕۆژ بوو کڕێوە لێی کردبۆوە، کوتە پەیدا ببوو. هەور و هەڵا ڕەویبوو، تاو و ساوێکی خۆش دنیای بووژاندبۆوە،زەنگاڵم لێ هەڵکێشا و دار دەستەکەم دەست دایە و ڕێگام داگرت هەموو لایەک سپی دەچۆوە. دیمەنی کێوی هەزار بە هەزار و دۆڵ و شێوان لەژێر ڕووبەندەی سپیدا بەڕاستی جوان و دڵڕفێن بوو. بەتایبەتی کە بەتیشکی هەتاو

نزیک نیوەڕۆێنە گەیشتمە گوندی "ک.." گوندێک بوو وەک زوربەی گوندەکانی کوردستان. لە قەدی بەر ڕۆژی کێوێکدا دروست کرابوو، خانووبەرەکانی لەگەڵ سەدان ساڵ لەمەو بەر فەرقێکی نەکردبوو. هێندێک قوڕ و بەردیان لەسەر یەک دانابوو و چرپی و هەڵاشیان بەسەردا دابوو. قوڕەبان و گڵەبانیان کرد بوو و دەرکێکی کورت‌تر لە بەژنی پیاویان وێ خستبوو. لە دوورەوە دیار بوو خەڵکی بێکار لەسەربانان و گوێ سوانان خەریکی مێشێن و

ساز بکەن. دوو سێ منداڵی چکۆڵەتر لە تەنیشت ئەوان لەبن دیوارێک، لەبەر بەرۆچکە دا هەڵکرووشمابوون و چاویان لە شێرە بەفرینەکە بڕیبوو. منداڵەکان دەیانویست دەم و لووت و چاو و برۆی بۆ دانێن کیژۆڵەیەکی چوار پێنج ساڵانە کە لەبن دیوار هەڵترووشکابوو و بە وردی چاوی لە شێرە بەفرینەکە بڕیبوو بە دەنگێکی خەمباری لەرزۆکەوە گوتی:

ـ کاکە !کاکە مەندە!

کوڕێکی حەوت ساڵانە کە لەگەڵ هاوڕێکانی خەریکی ۷

دەبریسکاوە.

جار جارە تووشی یەک دوو ڕێبوار دەهاتم و تێک هەڵا دەتگووتین، ماندوو نەبوونی‌یەکمان لێک دەکرد و هەر یەکە ڕێگای خۆمان دەگرت. چەل چەلە لە کوتەم لادەدا و تا ئەژنۆیان لە بەفر ڕۆدەچووم. هەرچۆنێک بوو گەلێک هەوراز و نشێوم بڕی و دۆڵ و شێوم پێوا و

جگێن و سەیر و ڕوانینن.

بەفر کووچە و کۆڵانی گوندی ئاخنیبوو و لە زۆر جێگایان ڕێکی سەربانان ببوو. چەند کۆڵانێکم پێوا. گەیشتمە مەیدانۆچکەیەک. لە سووچێکی حەوت هەشت منداڵ خەریکی خلیسکێن بوون. لەسەر ڕێگامدا چەند منداڵی دێ بەفریان کۆ کردبۆوە و خەریک بوون پەیکەرەیەکی

سازکردنی شێرە بەفرینەکە بوو، ئاوڕێکی لێ دایەوە و گوتی:

ـ دەڵێی چی نەشمیل گیان؟

کچۆڵەکە هەر بەو دەنگە بریندارەوە گوتی:

ـ کاکە تۆ خوا وای ساز بکە کە قەت‌قەت سەری نەئێشێ...

مەندە چاوێکی پڕ لە بەزەیی لێ کرد و بزەیەکی

ساردی هاتێ و گوتی :

ـ باشە نەشمیل گیان !

بێ ئیختیار بەم وتە و وێژە مووچورکێکی ساردم بەلەشدا هات. مەندە بە ئارامی سەری وەرگێڕا و لەپڕ چاوی بە من کەوت. ماندوونەبوونی لێکردم، دوا بە دوای ئەو منداڵەکانی دیکەش بەخێر هاتن و ماندوونەبوونیان کردم، منیش بۆ ئەوەی عالەمی خۆشی منداڵییان لێ تێک نەدەم، بەخۆشی جوابم دانەوە و پرسیم :

ـ ئەرێ ماڵە کاک رەشە لە کوێیە ؟

هەر ئەو کوڕە کە ناوی مەندە بوو گوتی :

ـ ئەوەتا ماڵە ئێمەیە و فەرموو پێشانت دەم .

ئەوەی گوت و وەپێش کەوت، بیرم لە قسەکانی نەشمیل دەکردەوە مەبەستی چ بوو کە گوتی : کاکە! تۆ خوا وای ساز بکە کە قەت قەت سەری نەئێشێ ؟

زۆرم پێ سەیر بوو منداڵێکی چوار پێنج ساڵانە بۆ دەبێ قسەی وا بکا ؟ بۆ لەو تەمەنەدا دەبێ قسەکانی خەمی لێ ببارێ؟ بۆ شاد نەبوو؟ ئەدی مەندەی برای ؟ ئەویش وا دیار بوو لەگەڵ خەم و پەژارەی نەشمیل ئاشنایە. لە وەڵام دانەوەی، لە روانینی دڵسۆزانەی، لە بزەی سارد و پڕ لە بەزەیی ئەودا ئەوە بەدی دەکرا، هێشتا وەڵامێکم بۆ پرسیارەکانی خۆم نەدۆزیبۆوە کە مەندە رایەڵ و پۆی خەیاڵمی پساند و گوتی :

ـ فەرموو، ئێرە ماڵی ئێمەیە .

ماڵێک بوو وەک ماڵەکانی دی . درگای لەق و تەق، دیواری مۆرە، حەوشێکی گەورە و خوار و خێچ کە لە هەر سووچێک هێندێک تەنەکە کۆن و تەختە شکاو و دار و بەرد کەڵەکە کرابوون .

بەفرەکەیان لە نێوەراستی حەوشەکە دا هەڵدابووە و بەو شوێنانەی کە لێی دیاربوون مەندە و نەشمیل خلیسکێنیان لێ کردبوو. مەندە لەسەریەک دەیگوت :

– فەرموو، فەرموو، ماڵە خۆتە ،باوکیشم ـ هەر ئێستا دێتەوە.

لە دوایە هەرای کرد :

– دایە! دایە! میوانمان هات.

دەنگێک لە نێو ماڵەوە وەڵامی دایەوە :

– میوان بەخێر بێ ، سەرچاوان ، راکە دەرکەی سەرێ بکەوە، لینگدە .....

مەندە گورجانە لە چەند پلیکانان وەسەر کەوت و دەرکەی دیوێکی کردەوە و منیش ذوا بە دوای ئەو وەژوور کەوتم ، دیوێک بوو سارد و سڕ، وادیار بوو لەمێژە ئاوری لێ نایساوە و میوان رووی تێ نەکردووە . مەندە خێرا سێ سەرینی بۆ دانام و دۆشەگچەیەکی راخست و خولقی کردم رۆنیشم ، بۆخۆشی وەدەرکەوت، هۆدەکە دیوارێکی نارێکی بوو، لەسەر سواخی دیوارەکە گڵە سپیان تێ هەڵسوو بوو، دزلێویش نەبوو ، دوو تاقەی بچووک لەسەر دیواری ئەملا و ئەولای دیوەکە دا سازکرابوو کە هێندێکیان دەفر و دەوری پلاستیک و چەند کاشی و مەترەتییان بۆ جوانی لەسەر دانابوو، چوارچێوەیەکی چووکە ، لەلای سەرەوە هەڵاوەسرابوو کە زۆر بێ ـ زەوقانە دە پازدە وێنەی جۆر بەجۆریان تێ نابوو،لەولاتر ئاوێنەیەکی تۆز لەسەر نیشتوو خۆی دەنواند ، بەرامبەر دەرکەی لە لای ژوورەوە پەنجەرەیەکی بێشووشەی نایلۆن لێ درا و بەرەو کۆڵان دەکراوە، لە لای راستی پەنجەرەکە هومایلێکی سپی کە گوڵی زۆر ناحەز و زەق و گەورەی لێ چندرابوو چەند کوتە جلکی داپۆشیبوو. لەلای چەپیشەوە سۆبەیەکی سارد و سڕ داندرابوو .

خشپە خشپێک سەرنجی بۆ لای میچ راکێشام ،نایلۆنێکی سپی بە گوڵی سوورەوە لە دارەڕای دیوەکە درابوو کە نەیدەهێشت دڵۆپە و خاک و خۆڵی میچەکە بڕژێتە خوار. یەک دوو مشک بەسەر نایلۆنەکەدا غار غاردێنیان بوو، چاوم لە مشکەکان بڕیبوو کە دەرکەی دیوەکە کراوە سەرەژنێک بە جلکێکی ئارداوییەوە وەژوور کەوت و بە گەرمی بەخێر هاتنی کردم، وادیاربوو تازە لەسەر نان کردن هەستاوە ،ژنەکە بۆ وەڵامی من رانەوەستا و خێرا بەرەو سۆبەکە چوو و لە حاڵێکدا کە خەریکی هەڵکردنی بوو گوتی :

– ل،خۆم رووسارد،خەجاڵەتێ دیوەکەش ساردە ،قەت دەزانی ئەمساڵ چ بەفرێک باری؟ باشە شکوور دوو سێ رۆژە هەڵیبرینگاندووە و خۆشیکردووە

لەو دەمەدا نەشمیل وەژوور کەوت و سڵاوی کرد ،وەڵامم دایەوە و گوتم :

– چۆنی نەشمیل گیان !

– باشم، سڵامەت بی .

نەشمیل و دایکی پێیان سەیر بوو کە چۆنە ناوی دەزانم، قسەکانی نەشمیلم وەبیر هاتەوە و دەنگی لە گوێمدا دەزرینگایەوە کە دەیگوت :

– کاکە! تۆخوا وای ساز بکە کە قەتقەت سەری نەئێشێ ..."

دیسان چوومە نێو دەریای خەیاڵەوە....مەبەستی ئەو کچۆڵەیەکە دەتگوت پەپوولەیە چ بوو ؟ هۆشم بەلای نەشمیلەوە بوو ، نەمزانی دایکی چی گوت کاتێ وشیار بوومەوە کە دایکی نەشمیل دەیەویست وەدەرکەوێ ، گوتم :

– براژن! ئەرێ کەنگێ کاک رەشە دێتەوە ؟

– هەر هەنووکە پەیدای دەبێ .مەندەم بە دوایدا ناردووە،

دوا بە دوای ژنەکە نەشمیلیش وەدەرکەوتە پێش ئەوەی بڕوا ، گوتم :

– نەشمیلێ ! کچم ! چۆڕێکم ئاو بۆ بێنە تینوومە ، بەڵام بۆخۆت بیهێنە با دایکت خەریکی کاروباری خۆی بی.

دایکی وەڵامی دایەوە :

– ئەوا چای دێنم .

وەدەرکەوتن، سۆبەکە وەگرفە گرف کەوتبوو. مشکەکان بێ هەستبوون، دیسان فیکر هەڵی گرتم ، ڕێگای دوور و درێژ ، بەفر و کوتە ،ماندوویی، کاک ڕەشە ،مەندە ، نەشمیل.... کەبیرم لە نەشمیل دەکردەوە

# ژاکاو

بێ ئیختیار بەزەییم پێدا دەهاتەئەو ، هەڵبەز هەڵبەزی هاوتەمەنەکانی نەبوو ،ڕەنگی بزڕکابوو ، خەمێکی نهێنی دەیتواندەوە... لەودەمەدا جیڕەی دەرکەهات .نەشمیل بوو دەفرێکی ئاو لەسەر دەستبوو بە ئارامی هاتە پێش و گوتی:

– فەرموو

لێم وەرگرت و گوتم :

– رووتسپی بێ کچم ! بە بەختی چاک بی .

ئاوەکەم خواردەوە و گوتم

– نەشمیل تاوێک لە لای مامی خۆت دانیشە .

دەفرەکەی لێ وەرگرتم و ٧

کەمێک پشتا و پشت کشاوە و ڕۆنیشت و دەفرەکەی لە لای خۆی دانا ، شانەیەکم کە بە وێنەی هەژدیها دروست کرابوو و بۆ دیاری بۆ کچەکەی خۆم کڕیبوو لە باخەڵم دەرهێنا و دامێ و گوتم :

– ئەم شانەیەم بۆ تۆ هێناوە ، پێت جوانە ؟

بۆ یەکەم جار بزەی هاتە سەر دەمی و شانەکەی لێ وەرگرتم و گوتی :

– زۆر جوانە ، قەتم شانەی وا نەدیوە .

بە دەرفەتم زانی و لێم پرسی :

– نەشمیل گیان ! لە دەرێ کە کاکت شێرە بەفرینەی ساز دەکرد بۆ گوتت " کاکە تۆ خوا جۆرێکی ساز بکە کە قەت قەت سەری نەئێشی ..." ؟

بزە لەسەر لێوی نەما و فرمێسکی لە چاوان گەڕا و گوتی :

– ئاخر ئەمن سەرم دێشێ . هەمیشە ژان دەکا .

کزەم لە جەرگەوە هات . نۆرەی من بوو ئاوم لە چاوان بگەڕێ ، زایەڵەی دەنگی نەشمیل لە گوێمدا دەزرینگایەوە ، بەڵام بۆ ئەوەی دڵخوشی بدەمەوە ، گوتم :

– جا ئەوە هیچ نیە . کچەکەی منیش وەک تۆ بوو بردمە لای دوکتۆر چاک بۆوە

ئەدی تۆ نەچوویە لای دوکتۆر؟

– ناوەڵڵا .دایکم هەر بە باوکم دەڵێ بیبە سەر دوکتۆر باوکم بە قسەی ناکا .

– هەڵبەت پێی نەکراوە . پێی دەڵێم بتبا ، ئەگەر نەیبردی بۆخۆم دەتبەم .

خونچەی ژاکاوی ڕوومەتی بەو قسانەی من کراوە . چاوێکی لە شانەکە کرد و دەفرەکەی دەست دایە و هەستا و گوتی :

– ئەوا دەچم چای دێنم . تو خوا لەبیرت نەچێ بە باوکم بلێی .....

* * * *

کاتێ لەبارەی نەشمیل دا لەگەل کاک ڕەشە دوام لە کەمتەرخەمی ئەو سەرم سووڕما ! دەیگوت لاپەڕ و دوورە شارین و تا ئێستا پێم نەکراوە...! نەشمیل پێنج ساڵانە بوو لە ماوەی پێنج ساڵی رابردوودا باوکی پێی نەکرابوو ئەو بەستەزمانەی بەرێتە سەر دوکتۆر و چارەی ئێشی سەری بکا ! نیشانەی بێ دەرەتانی و هەژاری بوو یا کەمتەرخەمی و بێفەرهەنگی.

ئەوا مانگێک دەبێ کە گوندی " ک..." م بەجێ هێشتووە ، کاک ڕەشە بەڵێنی پێ دام کە حەوتووی تێ وەرنەگەڕێ نەشمیلی بەرێتە دوکتۆر، جا ئیدی نازانم چی کردووە ؟

* * *

ئەوی لێرەدا دەیخوێننەوە بەسەرهات و ژیان نامەی شاعیری پایەبەرزی هاوچەرخمان "ماموٚستا حەقیقی"یە بە نووسینی خوی . دیارە بوٚ ناسینی پلەی شیعری هونەری شاعیر ئەوەندە بەس نیە و دەبێ شیعرەکانی لێک بدرێتەوە . بەلاّم بە داخەوە دیوانەکەی بلاونەکراوەتەوە و جگە لەو چەند پارچە شیعرەی کە تا ئێستا لەسروەدا بلاو کراونەتەوە ئەوانی تریمان بەدەست نەگەیشتووە . هیوادارین دیوانی شیعری ماموٚستا حەقیقی هەرچی زووتر لە چاپ بدرێ و تینووانی شیعر و ئەدەبی کوردی چیدی لە چاوەڕوانیدا نەمێننەوە.

شاعیرانی کورد

# ماموٚستا حەقیقی:

# ژیانی من

"عیلم وزانین"

بەری باغی ژیان شیرینە گەرزانینە ئەوژینە — لە بابەت خوێندنیٚ پێغەمبەری موختارفەرموویە

نەزان وەک هەژگەلێ بێ کەلکە بوٚسووتان وپەرژینە — وەدووی خوێندن کەون بچنێ ئەگەرچوونوبەرەوچینە

هونەردا رێکی بەرزەدوورومەرجانە. لق وپوٚپی — خەیالێکی نەکەن وەخت وزەمانێکی هەیەخوێندن

هونەروەرنامریٚ چون باغەوانی عیلموزانینە — لەبێشک رازەمانی خوێندنیٚ تاکاتی تەلقینە

لە خویندن چاو مەقووچێنەمەبەمایەی پەشیمانی — مەلێن بوٚنێرومیٚ فەرقی هەیەفەرموویەتی فەرزە

نەسیبی دوژمنت بیٚ جاهیلی بارێکی سەنگینە — لە سەر کوللیٚموسولمانیٚ چ میٚبێت وچ نێرینە

نەزانین عەیبە ،نازان سووکە ،ژینینەنگەبڕوانە — «حەقیقی»وەک نەزانین ئافەتە بوٚ دین ودنیایە

وتەیزاناچشیرینە ،وشەی نازان چ نەنگینە — حەقیقەت عیلموزانین زیبی دنیاوزیوەری دینە

ئەگەر بتەویٚ شیوی بوورە وبەیاری زەوی و زاری ژیان بە وردی وەرد بدەیەوە تەمەنێکی دوویاتەتپیٚ دەویٚ ئەویش بەو مەرجەی هەموو رووداوی ژیانت پشوو بەپشوو وهەنگاو بە هەنگاو لەبیر بمێنیٚ کە ئەویش هەرگیز پێک نەهاتووە و نایە . جا ئەگەر وایە دمبیٚ یەک لە هەزار و دەنک لە خەروای بێنیتە ئەژمار کە وابی ئەوا بیرەوەری یەکی سووکەلەو چووکە لەتان پێشکەش دەکەم دەبا.

کورتە چیروٚکی بەسەرهاتی ژیان<br>
چاری ناکا دەفتەری حەفتامەنی<br>
من گوتم حەوسەد مەنی پیٚڕادەگا<br>
ئەو سەری لیٚ راوەشاندم پێکەنی

ناوم عەبپاس و" تخلص" و شوٚرەتم ، حەقیقی یە. کوڕی عەلی پاشا ، کوڕی بزایم

ئاغای تالاّ و کوڕی شێخ ئاغا کوڕی بەیرەم ئاغای باپیرە گەورەی عێلی دێبوکریم .
دانیشتووی شاری بۆکانم سالّی هەزاروودووسەد و هەشتادویەکی شەمسی لە دێی مەرجان ئاوای ملّکی خۆمان لەدەشتی حاجی حەسەن هاتوومە سەر دنیا . دایکم ناوی زارا ـ کچی محەممەد کەریمی خەلّکی نەونێوە یە وەختێ منی بووە مسقالێکی شیر لەمەمکی دانەبووە من بە شیری دایەنیک بە ناوی شەوکەت فرچکم گرتووە .بابم باسەواد وئەهلی عیرفان بوو. دایکم نەی خویندبوو بەلام ئیجگار بە بیرو هوش بوو و بەقەد خویندەواریکی دەزانی . چونکە لە مالە بابیشی و لە مالە بابیشم لەگەل خویندەواران ژیابوو .

وێنەی مامۆستا حەقیقی لە سالی ١٣٢٠ی هەتاویدا

جا برای بەڕێز لێرە دائالّ و گۆڕێکی حەسێبی بۆ تایفەکەم دێتە پێش کە ئەگەر نەختێ سەرنجتان بۆ لای ئەو مەبەستە رانەکێشم گێڕانەوی پاشماوەی بەسەر ، هاتەکەم سەر لێشێوێن دەبێ و پووچەلّ. دەنوێنێ و وەبەر پلاری چی بەسەر چی یەوە دەکەوم . ئەوا برووسکێکتان لەو رووداوە ، پێشکەش دەکەم بەو مەرجەی نەلێی ئەوە داستانی رۆستەم و ئەسفەندیارە یا سەرگوزشتەی شاعیرێکی هەژار .

تایفەی ئێمە کە دێبوکرین و مەشهوورن بە شێخ ئاغایی زەمانی زوو پیاوی زۆر ئازا و ناو بەدەرەوە یان لێ هەلّکەوتووە هەر لەبەر ئەوە زۆر کەمیان بەمەرگی تەبیعی چوون و زۆرتریان لە شەڕاندا کوژراون .
بە تایبەتی دووکەس لەوان بەناوی عەزیزە سوور و میرزا رەشید کە هەوەلّیان مام و دووهەمیان ئامۆزام بوو قارەمانی زەمانی خۆیان بوون ولە نێو عەشایری کوردی ناو بانگیان بووە و ئێستاش دوای نیزیکی قەرنێک لەسەر زار وزمانان هەن و لەبیر پیاوە قەدیمەکانی کوردواری ماون .

چەند سالێک پێش شەڕی هەوەلّی جیهانی لەو دەشتەی کە نیشتمانی قەدیمی وملّکی باب و باپیری ئێمەبوو شۆڕش و پەلامارێکی نابەرا- بەر دژی بەرەی ئێمە بە تایبەتی و نافەرمانی لە فەرمانی جابرانەی سەمەد خانی شجاع الدولە حاکمی تەورێز روو دەدا ، کە گێڕانەوەی ئەو داستانە دوور و درێژە لێرەدا جێی نابێتەوە وبە قەولی مەشهوور بەری لە پشتی گرانتر دەکەوێ . بەلاّم دەبێ هیندێکی لێ بگێڕمەوە وبرێکتان بۆ ، بگێڕمەوە .

بەکورتی ئاوری شەڕ هەلّدایسێ و ئەو مەلّبەندەی داهگرێ و لە چەند شەڕی قارەمانانەدا کوشتارێکی زۆر لە دوژمن دەکرێ شایەرانی ئەودەم بەیتو باویان بۆ ئەو رووداوە رۆناوە و بە قارەمانە- کانی شەڕیان هەلّ گوتووە بە داخەوە ، درێژەی شەڕو لەشکری زۆری دوژمن و هێرشی پەیتا پەتیای بە توپ و توپخانە وە دەبیتە هوی تیکشکان و لیقەومانی خزمو قەومان و پەرێوەبوونی هەر بنەمالە یەکیان بۆ مەلّبەندێکی دوور لە ئالۆزی و ئاژاوە بەلاّم عەیزە سوور ، هەرچی براو برازا و خزم و ئامۆزا هەولّی لەگەلّ دەدەن بڕوا بە قسەیان ناکا و دەلێ من هەتا دەکوژرێم لەجێی خۆم نابزووم .چونکە مردنی بەسەربەرزی باشترە لەژیانی بەسەرشۆڕی .

تەقە بۆ چەند رۆژێک رادەوەستێ . لەو بەینەدا عەیزە سوور بەسوارەکانی دەلێ بوون ئەسپان نالّ بکەن و فیشەکان بکڕن و خۆ

سازبکەن بۆ شەڕێکی کە بەو زووانە بەری
دەرکێمان پێ دەگرێ و دوژمن دێتەوە سەرمان.
سوارەکان بەڕێ دەکا بۆ بەرە بەیان دووا
ڕۆژ لەشکری دوژمن پەلامار دێنێ و دەوری ،
دەدەن و تەقە دەستپێ دەکا .قارەمانی
بەرەنگار بوونی دوژمن لەوشەڕەدا تەنیا
عەیزە سوور و ناز خانمی کچی دەبێ . ئەو
کچە بۆ ئازایەتی و ئەنگێوەیی ناوبانگی
بووە دەگێڕنەوە دەڵێن هەر لەشەڕی ئەو
ڕۆژەدا کەمتر سەرێک بووە لە سەنگەر
دەرکەوێ وبە یەکەم گوللەی ئەم شێرە
ژنە مێشکی بە حەوادا نەچووبێ . میرزا
ڕەشید و سوارەکانی زۆر لەو شوێنە دوور
نابن و چاوەڕوانی ڕووداوێکی ئاوا دەبن.
هەر خەبەریان دەدەنێ رادەکەنێ ودەگەنێ
بە لەشکری دادەدەن و دادڕ دادڕیان
تێدەخەن بەڵام بە داخەوە درەنگ چونکە
عەیزەسوور لەوشەڕەدا دە کوژرێ ...

**ئەم بیستووە لە بەردی نەدابێ خولی زەمان**
**تێی دابێ هەر سەرێ سەودای سەروەری**

نازخانمیش بریندار دەبێ بەڵام لەشەڕ
ناکەوێ . ئەو شەڕە تارۆژ ئاوابووە درێژەی
دەبێ . لە ئاکامدا دوژمن دەشکێ وکوشتارێکی
زۆری لێ دەکرێ و تەقەمەنییەکیزۆری لێ
دەگیرێ ئیدی لێرەدا شەڕ بۆ ماوەیەکی نا
مەعلووم کۆتایی دێ وتایفە بنەبڕ دەبن.
جا لە وئاڵ و گۆڕ و بڵاوبوونەدا ماڵی ئێمە
دەچێتە مەر خوزی ملکی شەهیدی خوالێ خۆشبوو
سیف الدین خانی ئەردەڵان حاکمی سەقز .منیان
لەو دێیە نارده قوتابخانە لای مەلا قادر
ئاغا ناوێکی ئیفلیج کە بە داشقەیەکی
دەستی دەنهێنا حوجرە و دەنبردوە ماڵێ. لە
هەوەڵەوە (٢٩) حەرفی ئەلف و بێ سوورەی
حەمد کە هەر یەک لە دیوی تەتەڵەیەک
دەنووسرا پێی خوێندم.دوا یە جزوی عەمی
قورئان و وردە کتێبی سمایل نامە و ناگەهان
و ئەی شودە و جورم بەخشم کەهەموویان
شیعری فارسی بوون خوێند .

بە داخەوە لە وسەرو بەندەدا بڵێسەی ئاوری
شەڕی شوومی جیهانی هەوەڵ گەیشتە ئێران
و لەشکری ڕۆم وڕووسیە وڵاتی ئێمەیان
کردە شەڕگە. ئێمەش پەڕیوە بووین و چووینە
مۆڵبەندی شاری سلێمانی لە ومانەوەدا کە
لەبیرم نەماوە چەندی خایاند خوێندنم
پەکی کەوت تاوە ختێکی خەبەری ئەمین
بوونەوەی وڵاتمان بۆ هات گەڕاینەوە شوێنی
خۆمان . کتێبی گوڵستان و بۆستانی سەعدی
و کیمیای سەعادەتی ئیمامی غەزالیم لە
خزمەت بابم خوێند .
هێندەی پێ نەچوو دیسان چەرخ سووڕێکی دیکەی
پێدا ین و رزق ونسیب لە وڵاتی باب و
باپیرمان هەڵ کەندرا و لەکۆکەوقەرەداغی
محالی ئێل تەیموور دامەزرا .
لەوێش شیخ ئاغای مام ومیرزا ڕەشیدوجەلیل
ئاغای ئامۆزام کەهەر سێکیان بۆ ئازایی
شۆرەتیان هەبوو دوابە دوای یەک لە
شەڕەکانی عەشیرەتیدا کوژران ساڵی دوایە
بابم ئەمری خودای بەجێ هێنا وخوێندنم
پەکی کەوت بەڵام لە ماڵێ کتێبی شاعیرانی
فارسمان زۆر هەبو و تەماشام دەکردن .
بەبۆنەی متالای زۆر و بێکاری زەوقی شیعر
گوتنم بزووت و ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی دەستاند
چوارێنە و غەزەل و قەسیدە و تەرجیع
بەندم دادەنا . غەزەلی مەولانای ڕۆمی و
فارسی و هی سالم و نالیم بە کوردی کردۆتە
پێنج خشتەکی .

حاجی باپیر ئاغای مامم خوا بیبەخشێ
ئینسانێکی ئەدەب دۆست و فەسیح و بەلیغ بوو
زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی زۆر چاک
دەزانی . شیعری زۆری بەوزمانە لە بەر بوو
تۆنی دەنگ و لەهجەیەکی وەهای بوو،کامە
شیعرسست وبێ مایە باکە ئەو دەیخوێندەوە ،
دەیگەیاندە ئەو پەڕی بەلاغەت و بەرزی و
رووحی دەبەر دەهێنا. جا ئەومامە بەتایبەت

دڵسوزه بەدایم منـــــــــی هـــــــان
دەدا بۆ شیعردانان و پـەرە پێدانی . بـە
ڕاستی ئەوەی هەمە لەوی ڕادەزانم ، ڕەوانــی
شادبێ .

ئەوجار بەنیازی خوێندنی علوومی دینـــی
چوومە مەدرەسەی ئیسکی بەغدا و ماوەیــەک
لەگەڵ خاڵەمین لەوێ خوێندمان . دوایـــە
لەگەڵ سەید کامیل چووینە مەدەرســـەی
باغچەو لەوێ درێژەمان بە خوێندن دا .

وەختێکی خوالێ خۆش بوو حاجی بایز ئاغـای
ئێلخانی زادە کە شەخسێکی زاناو و ئەدیب
دۆست و ئەهلی عیرفان و بە تەواوی مانـــا
موسوڵمان بوو وبە دڵێکی پاک بۆ پــــەرە
پێدانی عیلم و شەریعەتی ئیسلامی تێدەکۆشا
مەدرەسەی ئیسکی بەغدای گواستەوە دێـــی
قوڵقوڵە تا لەوێ لەژێر چاوەدێری خۆی دابێ
لە دوای ناردم چووم وماوەی ساڵێکی لەو
مەدرەسەیە خوێندم .لە و ماوەیەدا زۆر چاک
ئامۆژگاری دەکردم شەریکە ملکەکانم پەلاماری
ملکیان دام هەسی دانەوە و نەیهێشت غەدرم
لێ بکەن منیش بە هوی(**من لم یشکر الناس لم یشکر الله**) تاماوم دوعای بە خێری بۆدەکەم
و خودای لێ رازی بێ .

دوای خوێندنی "صرف ونحو" و"منطق"ئیدی
من دەستم هەڵگرت و لەساڵی "١٣١٣"ی شەمسی
چوومە مهاباد و لەدایوەی دارایی دامەزرام
و کچی خاڵی خۆم هێنا . بەڵام سەیوەما مۆستا
هێمن بە منداڵیش و جەحێڵیش هەردەڵێـــی
دەمە لاسکەی منی کردووە چونکە ئەویش بـە
ساوایی بەشیوی دایەن بە خێو کراوە وبـە
جەحێڵیش کچی خاڵی خۆی هێناوە . فەرقـــی
هەر ئەوەندەیە هەزار لەزەماوەندی من دا ،
هەڵ نەبەزیوە .

ساڵی ١٣٤٢ بازنشەستە بووم پێنج کوڕ و
چوار کچ و ٢٤ نەوەم هەیە . لە تەعتیلاتی
نەو رۆز و هاویندا دەورم دەدەن و ناوی ،
خۆم لەبیر دەبەنەوە .

دەلین بازێکی تیژ باڵ و تووانــــا
**چەلێکی بێچوە کۆترێکی رەپێ نـا**
فڕی چۆنێو لق و پۆپی چنـــارێ
لە سەربازی دەدی وراوچی لە خوارێ
تەمای بووقووتی دا ئەمیان لەسەرچڵ
نیشانەی گرتبوو ئەویان بەرەو دڵ
لە حەق هاواری کردوچاوی قووچانـد
خودا فەوری لە هەردووکان حەقیساند
ترازا تیری راوچی بازی پێکـــا
ئەویش مارگەستیماسی وەک خەشەی کا
نەجاتی بوولەچەنگی راوکەرو بـــاز
عەیان بووڕازی شوکرانەی لە ئاواز
ئەتۆش حاڵی دەبووی وەک ئەهلیحاڵی
لە هاژەی باڵ و ناڵە وگاڵەگاڵـــی
دەپارێزێ خودا خۆی پێ سپێـــری
لەبازی کۆترو کەروێشک لە شێـــری
بەسەرهاتی ژیان هەم خێروهەم شـەڕ
بە فەرمانی خودان "الله اکبـــر"

# سەرداری موسڵمانی کورد صلاح الدینی ئەیووبی

بەشی سێهەم

سەرداری موسڵمانانی کورد صلاح الدینی ئەیووبی

فارووقی کەیخوسرەوی

## شەڕەکانی خاچ پەرستی

شەڕی خاچپەرستی بە هێرشەکانی سەدەی یازدە و دوازدە و سێزدەی زاینی قەومی " نصارا"ی ئورووپای غەربی دەگوترێ. مەبەست لەو هێرشانە رزگار کردنی گۆڕی حەزرەتی عیسا ( ۶ )لە چنگ موسڵمانان بوو.

وشەی خاچ پەرستیش بۆیە بە کار دەبرێ کە هەرکەس لەو شەڕانەدا بەشداری دەکرد لە پارچەیەکی سوور خاچێکی دەبڕی و لە شانی راستی دەدروو . ( ۷ )

لە ساڵی ۱۰۹۵ ی.ز داپاپ " ئورووبەن" لە شاری " کلێرمۆن " لە وتاردانێکی ئاگریندا مەسیحی یەکانی بۆ وەدی هێنانی ئەو ئامانجە هان دا و لە ساڵی ۱۰۹۷ دا ئۆردوویەکی سەد و پەنجا هەزار کەسی بەرەو فەلەستین وەرێ کەوتن و دوای داگیر کردنی شاری نیقیە و ئورفا و تەرسووس و ئەنتاکیە و مەعرە شاری قودسیان گەمارۆ دا و تا ئەو کاتە تەنیا چل هەزار کەس لەو لەشکرە گەورە مابوو. دەوڵەتی فاتمی میسریش کە بە هۆی تێک

هەڵچوونەکانی لەگەڵ سەلجووقیەکان بەتەواوی کز و بێهێز ببوو نەیتوانی زیاتر لە مانگێک خۆ رابگرێ و شاری قودسی بەدەستەوەدا. سپای " نصارا " لە ژووئیەی ١٠٩٩ دا شاری قودسی گرت و دوای کوشتارێکی زۆر بێڕەحمانە و دڕندانە لە دانیشتوانی ئەو شارە حکوومەتی خۆیان بە سەرۆکایەتی "گودوفرۆ" لەوێ دامەزراند. گودوفرۆ لە نامەیەکدا بۆ پاپی نووسی: **ئەگەر دەتەوێ بزانی چمان بەسەر ئەو دوژمنانە هێناوە کە لە شاری قودسدا کەوتبوونە دەستمان، پێت رادەگەیەنم کە پیاوەکانمان لە نێو هەیکەلی سولەیمان و لە نێو پەرستشگادا بە نێو گۆمێکی خوێندا هاتوچۆیان دەکرد و و خوێن دەگەیشتە ئەژنۆی وڵاخەکانیان .(٨)**

پاش ساڵێک گودوفرۆ مرد و " بۆدووئەن "ی برای لە جێگای دانیشت ئەویش بۆ پتەوتر کردنی جێ پێی خۆی قەڵای گەورەی " شوبەک " و چەندین قەڵای دیکەی لە "کەرەک "، "تەبەریا"، "عەتلیت" " سەفد " بنیات نا. ئەتابەکی زەنگی سوڵتانی حەڵەب دەگەڵ خاچ پەرستەکان بەشەڕ هات و لە ساڵی ٥٣٩ ی.ک "١١٤٤ی.ز" دا ئورفای‌لێ ئەستاندنەوە و ئەم تێک هەڵچوونانە بوونە هۆی دەست پێ کردنی شەڕی دووەمی خاچپەرستی و نورالدین مەحموودی کوڕی ئەتابەکی زەنگی کە لە جێگای باوکی دانیشتبوو چەندین شاری دیکەی لە داگیرکەران ئەستاندەوە و شاری دیمەشقی لە مەترسی وان رزگار کرد . بەڵام خەلیفەی فاتمی میسر عازید کە توانای بەرنگار بوونی خاچپەرستەکانی نەبوو داوای یارمەتی لە نورالدین کرد کە وەک باسمان کرد، ئەویش اسدالدین شێرکۆ و صلاح‌الدینی بە لەشکرێکەوە ناردە کۆمەگیەوە و لە ساڵی " ١١٩٦ ی.ز"دا پەلاماری خاچ پەرستەکانی تێک شکاند. چۆنیەتی بەدەسەڵات گەیشتنی سوڵتان صلاح‌الدینمان باس کرد . لێرەدا دەچینەوە سەر شەڕی سوڵتان صلاح‌الدین لەگەڵ خاچپەرستەکان .

پاش ئەوەی بە گرتنی حەڵەب دەسەڵاتی هەموو ناوچە گرینگە ئیسلامیەکان کەوتە دەست سوڵتان صلاح‌الدین لە مانگی جمادی‌الاولی ساڵی ٥٧٩ ی.ک دا خاچپەرستەکان وەفاتی فەرڕوخ شای نوێنەری سوڵتان لە شامیان بەدەرفەت زانی و بە مەبەستی داگیرکردنی ئەو مەنتەقە بەرەو شام وەرێ کەوتن. لەو لاشەوە "رێنۆڵد ـ ئیرنات "ئەمیری " کەرەک " لەشکری بردە سەر " مەدینەی مونەووەرە" و بۆ چەندەمین جار رێگای بە حەجاج گرت . سوڵتان صلاح‌الدین بەلەشکرەوە رووی تێکردن و پاشەکشەی پێ کردن . دوایەش " کەرەک "ی گەمارۆ دا بەڵام نەیتوانی بیگرێ . خاچپەرستەکان داوای برینەوەی شەڕ بۆ ماوەی چوار ساڵیان کرد ، کە سوڵتان

> **ئەتابەکی زەنگی سوڵتانی حەڵەب دەگەڵ خاچ پەرستەکان بەشەڕ هات و لەساڵی ٥٣٩ ی.ک ١١٤٤ی.ز" دا ئورفای لێ ئەستاندنەوە و ئەم تێک هەڵچوونانە بوونە هۆی دەست پێ کردنی شەڕی دووەمی خاچپەرستی و نورالدین مەحموودی کوڕی ئەتابەکی زەنگی کە لە جێگای باوکی دانیشتبوو چەندین شاری دیکەی لە داگیرکەران ئەستاندەوە و شاری دیمەشقی لە مەترسی وان رزگار کرد .**

---

(٦) بە بڕوای مەسیحیەکان حەزرەتی عیسا کوژراوە و لە فەلەستیندا نێژراوە، بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە :"بێ گومان ئەو نەکوژراوە، بەڵکوو خوا بەرەو ئاسمان هەڵیکێشاوە."

(٧) تاريخ قرون وسطى ـ آلبرماله ص ٢١٧

(٨) تاريخ قرون وسطى ـ آلبرماله ص ٢٢٦

## صلاح الدین ئینسانێکی دەست و دڵ باز و خەڵکی فەقیر و هەژاری وەردەگرت

قەبوولی کرد و گەڕایەوە بۆ شام .

هێشتا ماوەی پەیمانەکەتی نەپەڕیبوو کە جارێکیتر حاکمی " کەرەک " ڕێگای بە کاروانێکی گەورەی موسڵمانان گرت و جگە لە تاڵان کردن ژمارەیەکی زۆریشی لێ گرتن و سووکایەتی پێ کردن.سوڵتان لەم کارەساتە زۆر تووڕە بوو و سوێندی خوارد کە بەدەستی خۆی تۆڵەی لێ بکاتەوە.

**دوا بە دوای ئەم ڕووداوە سوڵتان خەزای ڕاگەیاند و لە نزیکی "بوسرا" دابەزی و بنەی خست . وردە وردە لەشکری لە خۆ کۆ کردەوە و بە پێی بڕیاری شوڕای بەرزی نیزامی ڕۆژی ١٦ی ربیع الاولی ساڵی " ٥٨٣ ی.ک " = ١١٨٧ ی.ز "بەوەو سپای دوژمن لە ڕووباری " ئۆردۆن " پەڕینەوە . پاش شەڕێکی قورس کە لە بیست ــ هەزار شەڕکەری خاچ پەرست تەنیا ژمارەیەکی کەمیان دەرچوون، لە ٢٦ی ربیع الاولدا خاچ پەرستەکانیان بە تەواوی تێک شکاند و"گۆی " سوڵتانی قودس و " ڕێنۆڵد ئیرنات " ئەمیری کەرەک بە دیل گیران.**

سوڵتان بە پێی بڕیاری پێشووی خۆی لە ڕێنۆڵد خۆش نەبوو و بە دەستی خۆی کوشتی بەڵام لەگەڵ "گۆی "ودیلەکانی دیکە زۆر پیاوانە جووڵایەوە، جگە لە دووسەد کەسێک کە بە ڕەفتاری ناشایست دەگەڵ موسڵمانان ناوبانگیان دەرکردبوو ، هەموویانی بە ئیحترامەوە ناردە شام . لە دوای وت و وێژێکی زۆر بڕیار درا خاچپەرستەکان شاری قودس بەجێ بێڵن و لە بەرانبەر ئازادی خۆیاندا بۆ هەر پیاوێک دەدینار و بۆ هەر ژنێک پێنج دینار و بۆ هەر منداڵێک دوو دینار فیدیە بدەن. تازە بە تکای مەلیک عادیلی برای حەوت هەزار کەس و بە تکای ئەم و ئەو ژمارەیەکی زۆری دیکەی لە فیدیە ئازاد کرد کە زوربەی هەرە زۆریان لە هەژار و نەدار و دەست کورتەکان بوون .

**بە پێچەوانەی ڕەفتاری دژی ئینسانی خاچپەرستەکان سوڵتان صلاح الدین بە شێوەیەک دەگەڵ دیلەکان دەجوولایەوە کە مێژوو نووسانی بێگانەش نەیانتوانیوە ئیعتیرافی پێ نەکەن .**

سوڵتان صلاح الدین دوای ئازاد کردنی شاری قودس ، پەلاماری بردە سەر قەڵای "هونین " و "کەوکەب "و"سەفد" و " کەرەک" و بەرە بەرە هەموو شار و قەڵاکانی فەلەستین جگە لە " سوور" ی گرتەوە. بەڵام خاچپەرستەکان کە بە لەدەستدانی قودس زۆر سەر شۆڕ ببوون کەوتنەوە خۆ و خۆیان بۆ دەست پێ کردنی شەڕی سێهەمی خاچپەرستی ئامادە کرد . سوڵتان صلاح الدینیش کە تا ساڵی ٥٨٥ ی.ک " ١١٨٩ ی.ز" بۆ ئازاد کردنی مەڵبەندە ئیسلامی‌یەکان پەلاماری دەبردە سەر دوژمن . ناچار بەوە بوو حاڵەتی دیفاعی بە خۆیەوە بگرێ و پەلاماری خاچپەرستەکان بەرپەرچ بداتەوە .

( گۆی ) حاکمی پێشووی قودس بە پێچەوانەی پەیمانێک کە مۆری کردبوو ،لەشکرێکی زۆری لە "ترابلۆس" کۆ کردەوە لە ڕێگای دەریاشەوە پەیتا پەیتا خواردەمەنی و کەرستەی شەڕی پێدەگەیشت . سوڵتان صلاح الدین لە " مبرح العیون " لەشکری خۆی ڕاگرتبوو و چاوەڕوانی ڕووداوەکانی دوایی شەڕ بوو ، لە لایەکی تریشەوە قەڵای (شقیف ئورنوون) ی گەمارۆ دابوو ، بەڵام کاتێک زانی خاچپەرستەکان شاری " عەکا "یان گەمارۆ داوە ، بەشێکی لەشکرەکەی

**دادپهروهربوو . زۆر بهرووخۆشییهوه سکالای دهپرسین ووهدهستی دهگرتن .**

له دهوری " شقیف " بهجێ هێشت و خۆی بهرهو " عهکا " ڕۆیشت و ئهمیر تقی الدینی برازای توانی به پهلامارێکی شێرانه ئالقهی دوژمن دڕیدا و هێزی یاریدهدهر بنێرێتهوه نێو شارهوه . لهبهر درێژه کێشانی گهمارۆکه لهشکری سولتان صلاح الدین و پارێزهرانی شاری عهکا له وهزعێکی زۆر دژوار و نالهبار دا بوون و فهرماندهکانی سپای موسلمانانیش و رهیهکی زۆر بهرزیان نهبوو و داوایان له صلاحالدین دهکرد که درێژه به شهڕ نهدا.سولتان لهبهر ئهو وهزعه ونهخۆشی - یهکیش که تووشی ببوو زستانی ئهوی سالی به بێ پهلامار بردن بۆ سهر دوژمن له " الخروبه" رابوارد. بهلام له رۆژی جێژنی مهولوودی سالی ٥٨٦ ی.ک " ١١٩٠ ی.ز"دا رووی کردهوه مهیدانی شهڕ لهولاشهوه ئیمپهراتۆری ئهلمان " فرێدریک باربرۆس " به یارمهتی لهشکری خاچپهرستانهوه هات . سولتان صلاحالدین بۆ بهرگری لهو لهشکره داوای یارمهتی له خهلیفهی بهغدا و سولتانی مهراکیش "یعقوب المنصور"کرد بهلام هیچ یارمهتییهکیان بۆی نهنارد. ئیمپهراتۆری ئهلمان له چومێکدا خنکا و لهشکرهکهی له دوو قۆلهوه پهلاماریان برده سهر عهکا و لهشکری سولتان صلاحالدین . لهشکری سولتان لهم شهڕهدا شکا و بلاوهی کرد. ئهمما پاشماوهی سپای موسلمانان له ئۆردووگای سولتانهوه بهرنگاری خاچ پهرستهکان بوونهوه و تێکیان شکاندن .

له جمادیالاخری سالی ٥٨٦ ی.ک"= ١١٩٠ی.ز"دا هێزێکی گهورهی ئینگلیسییهکان بهسهرکردایهتی "کونت هانری" خوشکهزای پادشای ئینگلیس گهیشته عهکا و به یاریدهی گهمارۆدهرانی شارهوه چوو. سولتان که بهرهوڕوو بوون لهگهل ئهم هێزه بهرینهی لهخۆی رانهدهدی گهڕایهوه "الخروبه" و خاچ پهرستهکان شاری عهکایان خستهژێر تهوژمێکی زیاترهوه ،بهلام پارێزهرانی شارخۆڕاگرییهکی ئازایانهیان لهخۆنیشان دا وپهلامارده رانیان هیوابڕکرد. سولتان صلاحالدینیش له بێرووت را یارمهتی پێویستی بهپارێزهرانی شارگهیاند.

کۆنت هانری له نامهیهکدا داوای یارمهتییهکی زیاتری له پاپ کرد و دیسان تهبلیغاتی ئاینی له ئورووپا دهست پێکرا . له ربیع الاولی سالی " ٥٨٧ی.ک = ١١٩١ ی.ز"دا پادشای فهڕانسه " فیلیپ ئۆگۆست " به لهشکرێکی زۆرهوه خۆی گهیانده عهکا و دوا به دوای ئهویش پادشای ئینگلیس "ریچاردی شێر دل" که بۆ ئازایهتی له ئورووپا دا ناوبانگی دهرکردبوو گهیشته عهکا .

هێزی گهمارۆدهر . ههتا دههات زیاتر دهبوو و له زهوی و دهریاشهوه ههموو چهشنه پێداویستییهکیان

← ل ٩٨

سولتان صلاح الدین دوای ئازاد کردنی شاری قودس ، پهلاماری برده سهر قهلای " هونین" و " کهوکهب" و "سهفد" و " کهرهک " و بهره بهره ههموو شار و قهلاکانی فهلهستین جگه له " سوور" ی گرتهوه بهلام خاچپهرسته کان که به له دهست دانی قودس زۆر سهر شۆڕ ببوون کهوتنهوه خۆ و خۆیان بۆ دهست پێ کردنی شهڕی سێههمی خاچ پهرستی ئاماده کرد

وەرن پیاوی چاک بین ،با بۆ تاوێکیش بێ ،لە حاندی خۆمان ، خۆمان لۆمە بکەین، یا هەر نەبێ بۆ تاوێکیش بێ تووڕەیی و ئیحساسات وەلانێین ،لەمێژە تووڕەین ، لەوەتی وەبیرمان دێ کوتوومانەجارێک دەڵێن زستان ساردە ،کەچی هیچ ڕێزێک بۆقسەی خۆمان دانانێین ،لێکدا لێکدا دووپاتی دەکەینەوە، نە جارێک نە دووجار ...

بڵێی باوەڕمان بە خۆ بێ ، ڕەنگە بڵێن ئەمە چ پرسیارێکە ،بەڵام نا ، ئەمە پرسیارە و وڵام دانەوەشی گرینگە ،من دەڵێم یان باوەڕمان بە خۆ نیە ،یا ئەم باوەڕ و متمانەیە ئەوەندە نزم و کەمە کە شوین دانانێ. کورت تر بدوێم ، لەوەتی فامم کردۆتەوە گوێم لێ بووە کە سکالایان لە دەسی ڕوژگار و چەرخ و فەلەک بووە ،بە مرادمان ناگەڕێ ، چەپ دەگەڕێ ....و.......

بەڵام گوێم لێنەبووە کە هۆی ئەم بە مراد نەگەڕان و چەپگەڕانە بدۆزینەوە و لە کۆلکەی کەین ، کە بە ئاکام گەیشتین و ڕێگای بۆ دۆزراوە ، ئەم ڕێگایە بگرینە پێش ، جا ڕێگاکە برێ دوور بوو یا بە پێچ و گەوە و هەڵدێر کۆڵی لێ نەدەین و بیپێوین ،

وێنەگەرێک دەڵێ بەو ئاکامە گەیشتووم کە ئەگەر بە دەستی خۆم وێنەی دلدارەکەم بکێشمەوە ، کە گشت کات دیمەنی لە پێش چاومە ، سوکنایی دڵم دێ و ئەوە چەندەمین جارە کە لە کێشانەوەی وێنەکەدا تووشی تێشکان بووم ،لێیان پرسی واز ناهێنی و هەر لەسەر کارەکەت سووری ؟

لە وڵامدا دەڵێ سوێند بەدیمەنی دڵرفێنی دلداری شۆخ و نازدارم کە ئەگەر جاری هەوەڵ توانیبام وێنەکە بکێشمەوە لەوانە بوو لە دلدارەکەم وەڕەز بم ، بەڵام دووای ڕەنج و تێشکان هەست دەکەم کە رووحی من لە پەیکەری دلدارەکەم دایە ،کە وایە ،پێم خۆشە رووحم بگرمەوە ، کەوابوو ماندوو نابم ، بەڵێ بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاری کراو یەکەم مەرج ڕێگا ناسین، دووهەم مەرج ماندوو نەبوونە. وەرن با تۆ سکاڵێ خۆ ڕاگر بین ، بە تنۆکە ئاوێک وەمەلە نەکەوین،گر و

کفێک نەبین و دامرکێین . لەسەرەخۆ و هێدی و هێمن لایەنی باش و خراپی هەموو قسە و کردەویەکی لەبەرچاو گرین ، کاممان پێ باش بوو، بە قازانج بوو هەلیبژێرین، زۆر وابووە چاومان راستەقینەی نەدیوە ،یان لەحاندی نووقاوە ، زمانمان گرێداوە کە نەیلێین ، واش هەبووە کە وەبالمان کێشاوە کەچی دووای ماوەیەک تێگەیشتووین کە چەند هەلە و پەلە بووین. لە ئاکامدا خەفەتمان خواردووە ، ئەزموونی وامان زۆرن،باوەردی سرنجیان بدەینێ و کاتی ئێستامان بە ئەزموون لەرابردو و هەلسەنگێنین و گەلالە بۆ داهاتوو دابرێژین.با هەلەشە بوون بەس بێ ،کردەوەکانمان وتەکانمان لە تەتەلە بدەین ، با چیدیکە بە قسە تف لە دزێوی نەکەین ، کەسەر و ناهومێدی سواری شانمان نەبێ ،هەر کەس سمێلی سوور بوو هەرامە نیە بەردی سەر رێی یەکتر نەبین ژیانمان پێکەوەیە ، مردنمان لەگەلّ یەکە ، بێ یەک ناحاوێینەوە چون ئینسانین ، کۆمەلایەتی ( اجتماعی) بارهاتووین کەوابوو دەبێ بە دەرد و مەرگی یەکترەوە بین ، لە قامووسی کۆمەلدا بەختەوەری تاکە کەسی بێمانایە ، چارەرەشیش هەر بەم شێوەیە ،سەرەرای هەمووی ئەوانە لە تۆرەمە و رەگەزێکین ،بۆ فێنک بوونەوەی لەش و بیرمان لە گومێکدا مەلەی دەکەین،هەر کەس بیەوێ گۆمەکە پیس کا، لە پێش هەموانەدا بۆ خۆی پیس دەبێ .

**وەرن با چیدیکە تووک و نزا لە تاریکایی نەکەین ، لە جیاتی ئەوە کە سینگی لێ بوکتین و یەخەی لێ دارنین با هەموومان بە یەکەوە مۆمێک داگیرسێنین.**

---

**◄ بقیه سرمقاله**

و پر طلاوت که کاخهای ستم و جور را بلرزاند،خواهند ساخت ؟ چه کسانی بر عمر شبستان سیاه جهل و انحراف مهر پایان خواهند زد؟ و چه کسانی در برداشتنن پرده ریا و تزویر از چهره صاحب چهرگان پا بمیدان خواهند گذاشت ؟

و بالاخره چه کسانی در کالبد سرد و بیجان خودباختگان و بیگانگان از فرهنگ و معارف مکتب روح امید ،اتکاء به نفس واستقامت و پایمردی خواهند رسید ،

اکنون که ضرورت بهره ـ گیری از تعهد قلم روشن شد لازم است یادآور شویم که منهای دخالت عوامل استکبار اساسا خاصیت ابزاری قلم نیز خود حکم میکند که هرگاه جهت صحیح در بهره برداری از آن اعمال نشود فساد پدید میآید ،بعبارت دیگر (**قلم همچون تیغی است که باغبان با آن خار و خائنان با آن شار میچینند .**)

جان کلام آنکه ویژگی ذاتی قلم بلحاظ ابزاربودن از یک سو و تلاش وسیعی که از سوی دشمنان انسانیت درجریان است از سوی دیگر آژیر خطر را برای بازنگری مجدد به نقش و اهمیت قلم و تسلیح هرچه بیشتر جامعه نویسندگی به تعهد بصدا درآورده است که ما ضمن دعوت به همکاری از جامعه نویسندگان بویژه برادران و خواهران نویسنده کرد تلاشی را درجهت شناساندن ابعاد و ویژگیهای تعهدقلم و قلم تعهد باختطر و اجمال آغاز کرده و در شمارهٔ آتی دنبال میکنیم ، که امید مرضی خدای رحمان و مقبول جمیع و دوستان افتد .

**در این فرصت برخود لازم و واجب میدانیم که از همه سروران و دوستان عالم و ادیب و صاحب ذوق که در پی انتشار دومین شماره از سروه با استقبال بی‌نظیر خود ما را شرمنده الطاف خود ساختند نهایت تشکر را نموده و کماکان منتظر همکاریهای بیشتر هستیم .**

**والسلام‌علیکم‌ورحمه‌ا. . .وبرکاته**

# لەپس

سەری نامەم بە ناوی تۆ خودایە
کەبێ ناوی تۆ نامە بێ نەوایە

خوای بەرز و نەوی و هەوراز و لێژان
خوای رۆژی دەری بیتۆڵ و کێژان

خوای بەنبای دیار و نادیاران
خوای مێر و بەڵەنگاز و هەزاران

بە چاو لێک نانێ لێک هەڵدێنی چاوێ
بەهێزە دەستی تۆ هەوکاری ناوێ

ئەگەر چی حازر و نازر لە گشت جێی
خەیاڵ ناگاتە ئەو جێیە کە تۆی لێی

وجوودی تۆ ئەگەرچی روون و سوورە
لە رادەی دەرکی ئینسان بەدوورە

خوای هەست و وتە و بیر و خەیالان
خوای کوێر و کەڕ و کێڕ و گەوالان

بە جیرەی بێمنەت تێر و بە تێروو
لەسەر خوانی خوایەت مار و مێروو

بە تێر بوون و نەبوونی مووجە خۆران
لە دەرکی تۆ نیە تاران و تۆران

بەتۆ دەکرێ بنێری تیشکی تاوێ
کەبێ گیانی وەبەر بێگیانی باوێ

لە تۆ رایە تریفەی مانگ لە شەودا
ئەتۆی بێدار و باقیتر لە خەودا

بەر و باراوی تۆن ئەزمان لەزاران
لە دەس تۆدا دڵی یار و نەیاران

بە ئەمری تۆ هەور بارانی دێنێ
بەسەر چۆل و چیا دا دەی رژێنێ

بە ویستی تۆیە خێریان لێ دەبارێ
کەسی هاوین و پاییز و بەهارێ

ئەتۆ وات کرد کە زستانان بەسەرن
ئەگەر زستان لە ژێر بارستی بەفرن

خوایە ئەی خوای جوان و دزێوان
خوای ئەگریجە زەرد و کوڵمە زێوان

خوای سینەی سپی و نەرم و دڵی سەنگ
خوای بسک و گەرزنی شۆڕ و قەدی تەنگ

من ئەوڕۆ حەم ئەوێ لێت هەر زمانێ
زمانێک بێ کە بەسی تۆ بزانێ

زمانێک بێ گەزانی زارە کارم
بە هاسانی وشە باوێتە زارم

زمانێک بێ لەگەڵ ئەو واتە ئۆگر
کە تەنیا تۆ خوای ئیتر کەسی تر

خەیاڵی من منالێ بێ زمانە
دەنا یادی تۆ ئاوێتەی دڵانە

وتاری زۆرە بیلێ و چەشنی منداڵ
قسەی بۆ نایە دەیکاتە کڕ و کاڵ

# ـر خوا

لە چەند پەسنی تۆ زانا نەزانێ
ح دێ ئیتر لە دەستی بێزمانێ

دڵێکم بێ بدە دەریای ئەوین بێ
بەرین بێ ، بێ برین بێ، ئاگرین بێ

دڵێک بێ خوێن نەبێ دڵ بێ لە سینە
دڵێ بێ ژەنگ و گەرد و بوغز و کینە

بەجارێ زۆری هێنا دەردەداری
دەس و هەنگاوی شل کرد لەش بەباری

ئیتر با تەم لەبەر چاو نارەوێنێ
ڕوانگەی دیدە هەردێ وکورتی دێنێ

لە ئالۆزی وبارم را دیارە
کە ئالۆزم لە دەس دەرد و پەژارە

بنێرە خوایە هەتوانی برینم
کە ژانی دڵ بڕی ...ۆشی لە ژینم

ئیتر ئەوجار من و ژینێکی بێ وەی
ئیتر جێی ئاخ و داخان بگرێ ئۆخەی

خەمێکم پێ مەدە زێدەی توانام
خەمت خوایە لە توانا زێدە پێدام

بە ئەسپایی دێ دەنگی نادیاری
دەچرپێنێ بە گوێما جار بە جاری

کە ڕۆیی کاروان و بانگی لێدەکە
لەشت بێ ناچێ کیان دەرکە درەنگە

لەبەر بێ چارەییم هەنگاو بە هەنگاو
بەسەر شێواوی دەڕوانن سەر و چاو

دوا قۆناخی ڕێگەدم دەرگی نوێبە
خوا بکرە دەسم لەو هات و چۆبە

بەزەت پێم دابێ ڕووناکی بخە ڕێم
کە بەو ڕێ ڕاستەدا ڕزگار بم و بێم

بەڵام کەی تامی مەرگم بێ دەچێژن
لە کوردستانی ڕزگارم بنێژن

لە نێردەوسا و لە کوردستانی زەنوێر
لەش و گیان بەش بن و سەیران بکەن تێر

ئەگەر کار کەوتە بەخشینی خوایی
بە کست پارانەوێک دێنێ دوایی

تەمەن هەرچی هەبوو ڕۆیی لەخەودا
ئەبینم ئێستە زۆر کەم ماوە مەودا

لە ئەستۆم هێند گرانە باری تاوان
چەماون پشتم و ئەژنۆم لە تاوان

نیە تۆشەم لە ڕەحمی تۆ زیاتر
کە لەو ڕەحمە نیە هیچ تۆشە چاتر

ئەجا ڕێکم هەیە ئیتر نە ڕێی دی
بەرەو قاپیت ئەوە دێم هێدی هێدی

خالیدی حیسامی (هێدی)

ئامادەکردنی
نەسرینی جەعفەری

# مەرد و نامەرد

کابرایەک بوو یەگجار دەوڵەمەند، بەڵام ئەولادی نەدەبوو، زۆری چاک و پیر کرد، ژنەکەی ئاوس بوو و دوای نۆ مانگان خوا کوڕێکی ژیکەڵەی دایە، کابرا عەهدی کرد هەرچی دەتوانێ یارمەتی فەقیر و هەژاران بدا.

کوڕە گەورە بوو و دەبەر خوێندنی نا ، هەموو رۆژێ گیرفانی پڕ دەکرد لە زێڕ و و زێو و دەیگوت لە رێ بیدە بە فەقیر و هەژاران ، وای لێهات کوڕە لە دەرگا دەهاتە دەر خەڵکی دەیانگوت کاکی مەرد هات. ساڵها پێ چوو مەرد گەورە بوو.

ئێستا لاوێکی مەرد و رەند بوو و نێوی خۆی بە خەسار نەدابوو، رۆژێک لە قوتابخانە هاتەوە ، دیتی دایک و بابی دەگرین، چووە پێش کوتی :

- بابە! دایە! بۆ دەگرین.و دەبارێنن؟

بابە کوتی :

ـ رۆڵە چت لێ وەشێرم هەرچی هەمانبوو هەتا ئەورۆ تۆ داوتە بە فەقیر و هەژاران و ئێستاش سبەی چ نیە تۆ بیدەی بە کەس و ئێمەش بۆیە دەگرین .

دایک و بابی دڵ خۆشی داوە و کوتی :

ـ هیچ خۆ ناڕەحەت مەکەن هەر لەو شارە خەڵک دەمناسن ، لە جێی دی نەناسیاوم. بەیانی پێش ئەوەیخۆر هەڵبێ دەڕۆم بۆ شارێکی دی . دایکی بارگەوبنەی بۆ تێکنا و کازیوەی بەیانی کوڕ ملی ڕێی گرت . لە ڕێ تووشی ڕێبوارێک بوو کە جڵەوەی ماینێکی دەکێشا ، سڵاوی لێ کرد ، کابرا وەڵامی داوە و کوتی :

ـ کاکە نێوت چیە و بۆ کوێ دەچی؟

مەرد کوتی :

ـ نێوی من کاکی مەردە و دەچمە دێیەکی ئەو نیزیکانە ،

کابراش کوتی :

ـ نێوی من نامەردە ، واچاکە ببینە ئاواڵ .

مەرد کوتی : زۆر باشە .

چەند ڕۆژ پێکەوە ڕێیان دەپێوا و مەرد وەختی ژەمێ خواردەمەنی خۆی ساز دەکرد و دەیکوت فەرموو . کابراش لەگەڵی دەخوارد. قەت دەستی دە بارگەوبنەی خۆی نەدەدنا شتێک دەربێنێ ، تا وایلێهات خواردەمەنی کاکی مەرد بنەی هات . بەڵام نامەرد هەرکە برسی دەبوو قوونی تێ دەکرد و لەبن دارێک یا پەسیوێک نانی دەخوارد و هەر پێی وانەبوو کەسی لێیە . مەرد برسیەتی هێرشی بۆ هێنابوو. گەیشتنە دوو ڕێ یانێک ، یەکیان ڕێگایەکی ڕاست و خۆش ئەوی دیان بەردەڵان و ئەستەمێک . مەرد کە نەیدەتوانی بەپێی کابرا بڕوا ، کوتی :

ـ لێرە ڕا من لێت جیا دەبمەوەو ڕێی من ئێرەیە .

لەبەردەڵانەکە هەڵ بوو، کابراش بەرێی

خویدا ڕۆیی . مەرد بەو ڕێگا ئەستەمەدا ڕۆیی ، تاریکانی بەسەردا هات ، ئەشکەوتێکی گەورە لە دوورەوە دیار کەوت . مەرد کوتی : واچاکە ئەوشۆ لەو ئەشکەوتە سەرکەم، ئەو شاخ و بەندەنە پڕ لە دڕندەیە، چووە نێو ئەشکەوتەکە ، دیتی جێی مۆڵی دڕندانی لێ دیارە ، خۆی لە کەلێن و قوژبنی ئەشکەوتەکە حەشار دا، دوای چەند سەعات دیتی ورچێک و گورگێک و ڕێویەک هاتنە ئەشکەوتەکە. شەوێ پێکەوە دەردی دڵیان دەکرد ،

ئەو سەیە بتۆپێنی ، مێشکی ئەو سەیە دەرمانی شێت و هارە ، کچی پادشای ئەو شارە شێت بووە ، ئەگەر ئەو مێشکەی لەسەری نێن چا دەبێتەوە .

رێوی کوتی :

ـ ئێستا بنوون تا سبەی خوا گەورەیە .

بەیانی درندەکان رۆیین ، مەردیش جێی ورچەی داوە ، چەند کووپە خەزنەی تێدا بوو کۆلەبارێکی داگرت و سەری داپۆشیەوە . رۆیی لە رێ تووشی شوانێک بوو، نان و پێخۆرێکی لێ وەرگرت . دیتی سەگێکی رەش و زەلامی پێ بوو ، کوتی :

ـ ئەو سەیە وا دیارە سەگی چاکە،

شوانە کوتی :

ـ چەند ساڵە ئەو سەیەم هەیە ، ئێستا کەلاکی نەداوە ،

مەرد کوتی :

ـ پێم بفرۆشە .

کوتی : ئەگەر ئەو سەیەی بفرۆشم تازە ناتوانم شوانی بکەم .

مەرد کوتی :

ـ ئەوەندەت زێڕ و پارە دەدەمێ موحتاج بە شوانی نەبی .

شوانە سەگەی بۆ کوشتەوە مێشکی سەگەی دەرهێنا و لە پرێسکەی کرد، مەرد هەستا و چووە شاری کچی پادشای .

هەرای کرد : کێ نەخۆشی هەیە؟من شێت و هاران چا دەکەمەوە .

خەڵکی گوتیان : پادشا کچێکی هەیە شێت بووە و هەر کەس نەتوانێ چاکی کاتەوە دەیکوژێ .

مەرد گوتی : ئەمن چاکی دەکەمەوە .

مەردیان بردە کۆشکی پادشا ، پادشا گوتی : تۆ بتوانی کچی من چاکەیەوە دەیدەم بە تۆ ، بەڵام ئەگەر نەتوانی، چونکێ عەیبی کچی من دەبینی دەتکووژم .

مەرد گوتی : هەر جۆر تۆ بفەرمووی من

گورگ کوتی :

ـ چەند رۆژە نێچیرمان وەچەنگ ناکەوی ئەو ئەشکەوتە زۆر سەر بێ رۆزییە .

ورچ کوتی :

ـ ئەو ژانە سەرە نەبایە ئەمن یەک سەعات لێرە نەدەبووم ، چ بکەم لەو جێی لێی دەنووم خەزنەیەکی تێدا ، ئەگەر سەرم دێشی ، ئەگەر سەری وێ دەکەم ژانی دەشکێ.

گورگە کوتی :

ـ ئەگەر سەگە رەشی فلان دێ نەبایە ئەمن تێر گۆشتم دەکردن . ئاخ بۆ مەردێک

چاکی دەکەمەوە . چووە دیوی کچی پادشا و دیتی کچێکی جوان و لەبارە . بەڵام دەست دەوەشێنێ و ئاگای لە خۆ نیە .

گوتی : چەند نەدیم و قەرەواش بێنن و دەست و لاقی ئەو کچە بگرن و درێژی کەن . کچەیان درێژ کرد، مێشکی سەگەی لەسەری نا و دایپۆشی ، کچە خەوی لێ کەوت . پاش چەند سەعات وەخەبەر هات و بەسەر قەرەواشەکانیدا قیژاند .

- ئەو نامەحرەمە بۆ لێرەیە ؟

مزگێنییان بۆ پادشای برد، پادشا مەرجی خۆی بەجێ هێنا و کچەی دایە.چون هیچ ئەولادی نەبوو. پادشایەتی خۆی دا بە مەردی. مەردیش پاش چەند وەختان وەبیری هاتەوە کە خەزنەیەکی زۆر لە ئەشکەوتی داعباکاندا بەجێ ماوە . چەند کەسی نارد وەدەریان هێنا .

پیاو چاکی وبەخشندەیی مەرد هەربەردەوام بوو ، بەڵام لەو لاوە نامەرد ئەوی هەیبوو خواردبووی . وەسواڵێ کەوتبوو،هاتە ئەو شارەی مەرد پادشای بوو، خەڵکی پێیان گوت : پادشای ئێمە زۆر بەخشندەیە و لەو شارە کەس موحتاج نیە . مەرد بژیوی بۆ هەموو کەس پێک هێناوە تۆش بێبەش ناکا .

نامەرد چووە کۆشکی مەردی و داوای یارمەتی کرد و لەو وەختەیدا پادشا لەنێو باخیدا دەگەڕا .نامەرد چاوی پێی کەوت و ناسیەوە . هەرای کرد، مەرد ئەمنم نامناسیەوە ؟

مەرد هاتە پێش گوتی : ئەوە ئەتۆی ؟

نامەرد گوتی :تۆ کە چت نەما بوو چۆن ئێستا بوویتە پادشا ؟

مەرد گوتی : کاتێک لە تۆ هەڵبڕام چوومە ئەشکەوتێک و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە . نامەرد هەستا چووە ئەشکەوتەکە و خۆی شاردەوە . ئێوارێ درندەکان هاتنەوە، گورگ و رێوی هەر یەکەی کەلاکی مەرێکیان

پێ بوو، بەڵام ورچ زۆر قەڵس و توورە بوو،

گورگ گوتی : چیە بۆ وا قەڵسی ؟

ورچ گوتی : لەبەر ژانی سەرم حەجمینم لێ هەڵگیراوە ، ئاخ ئەگەر دەمزانی کی ئەو خەزنەی دەرهێناوە هەر ئێستا ونجڕ و نجڕم دەکرد .

رێوی گوتی : هەرکەسە لێرەیە .

گورگ گوتی : هەستن بگەڕێین ، بزانین لێرە نیە ؟

تەواوی کەلێن و قوژبنی ئەشکەوتێیان کرد نامەردیان دیتەوە ولەت بە لەتیان کرد . ئەمنیش هاتمەوە.کاڵەم دڕا چم پێ نەبڕا .

ئەو مێژووی ژیانەی کە کاک سەلاحی یۆسفی سەبارەت بە مەولەوی نووسیویە هیچ کەم و کورتی نیە و زۆر رێک و پێک و جوانە. بەس کەم و کورتی لەو شیعرانە دایە کە هی مەولەوی نیە و بە ناوی مەولەوی هێناویەتی.

لێرەدا ئەو شیعرانەی کە هی مەولەوی نیە دەیانهێنین و ئەوانەش کە هی مەولەوین دەیانهێنین،

**الف : ئەو شیعرانەی کە هی مەولەوی نین :**

١ ـ سێ بەیتی لاپەڕەی ٦٢ کە بە " **دەماخ وە نەشئەی سەربەرزان کەیل**" دەست پێدەکا .

٢ ـ دوو بەیت شیعری لاپەڕەی ٦٤ کە بە " **جە هەر تەڕەفدا مەوینوون گولزار**"دەست پێدەکا و هەروا دوو بەیت شیعری ئەوەڵی بەشی " **ئەوین و مەولەوی** "

**ب : شیعرەکانی مەولەوی:**

ئەو شیعرانەی خوارەوەم لە دیوانی مەولەو یدا وەبەر چاو نەهاتووە، بەڵام رەنگە هی مەولەوی بن :

١ ـ شیعری لاپەڕەی ٦١ کە بە " **مـن ویم مزانوو بێ ئەمریم کەردەن** " دەست پێدەکا .

٢ ـ شیعری ئەوەڵی لاپەڕەی ٩٨ کە بە " **خامەی سەراوێز نە چای سیایی** " دەست پێدەکا تا ئاخر .

٣ ـ دوو بەیت شیعری لاپەڕەی ٦٢ کە بە " **گوڵ چون رووی ئازیز نەزاکەت پۆشان** " دەست پێ دەکا .

شتێ من پێی بزانم مەولەوی هەر تەنیا یەکجار بە شیعر نامەی بۆ شێخ عوسمانی سراج الدین نووسیوە، جا رێکیان شێخ ئەم دوو شیعرە دەم دەمیەی بۆ دەنووسی:

یا کاغەز بڕیان یا مەلا مەردەن
یا خۆ عارتەن دۆس وە یاد کەردەن
خەمگین مەنیشە خەم بەدەر وەباد
فەلەک نمازۆ کەس وەخاطر شاد

مەولەویش لە وەڵامدا ئەو غەزەلەی بۆ دەنووسێ کە چەند شیعری دێنین :

شێخ دەولەمەند بەهرەی سەرمەدی
یاگەی حەقیقەت جیلوەی ئەحمەدی
جە شەو هەوارگەی فەنا ویەردە
پای هەردەی بەقا یاتاغگە کەردە
" متّصف " بە وەسفشانی و سیفاتی
" مشرّف " بە فەیز تەجەللای زاتی
نامەی رۆح ئەفزای شیرینت یاوا
دڵ وە مەردومەکدوو دیدەش ساوا
دەرگای حوقەی لاڵ دانەت شکاوان
جە رووی لوتفەوە ئینەت فەرماوان
«یا کاغەز بڕیان یا مەلا مەردەن
یا خۆ عارتەن دۆس وەیاد کەردەن
خەمگین مەنیشە خەم بەدەر وەباد
فەلەک نمازۆ کەس وەخاتر شاد»
ئەوەڵ من کێنان وجوودم جە کۆن
واچون دۆسەنان شەرتقەبووڵ تۆن
ئەر وەبێگانە وەر خێشم زانی
تۆ حەساوەنی وە هەر چیم وانی
دووەم چون کەسێ گەدایی کێش بۆ
یاد تەوازوع خەسڵەت وێش بۆ
ئەر بارۆ نە دڵ تەوازوع کەردەن
هەر عادەت وێش وەجا ئاوەردەن
بەڵام هەر کەسێ شێخی مسالەن
عادەت " استغنا ) و شێوەش جەلالەن
ئەر جار جارێ نام چون منی بەرۆ
خەرق ولعادەتی زاهیر مەکەرۆ

**یەکەم ئەوینی مەولەوی**

ئاخۆ ئەپۆرێ مەولەوی کە چەند ساڵ پاش تەواو کردنی عیلمەکان " عەنبەر خاتوون "ی لە موهاجیرە ئەوغانییەکانی دانیشتووی شارە زوور خواستووە ، ئەم ئافرەتە کە ژنی بووە و شەو و رۆژیان پێکەوە لە ژێر دەوارێکدا رابواردووە ، بووبێ بە هۆی ئەوینێکی ئاگرین و ئەم هەموو هەڵا هەڵا و شیعر و ئەسپابەی ؟

ئەڵبەت بۆ عیشقی ماڵ رووخاو ناتوانین سنوور دیاری بکەین و بڵێین بەس تا ئەم سنوورەیە ، بەڵام ئاگرین ترین عیشق لە سەرەتای تازەلاوییەوە سەر هەڵدەدا تا تەمەنی بیست و سێ و بیست و چوار ساڵی ، جا دەبێ بزانین مەولەوی لەم تەمەنە دا گیرۆدەی تۆڕداوی ئەوین بووە یا نا ؟

چەند ساڵ پێش لە ساڵی " ١٢٤١ کۆچی مانگی " مامۆستا سەید عومەری کوڕی شێخ ئەبووبەکر لە ساداتی " خانەگا "ی پاوە ، لە دێی خانەگادا مەدرەسەی بووە و دەرسی فەقێی داوە و ناوبانگی بە مەلا چاکی لە هەر دوو کوردستاندا بڵاو بۆتەوە ، رەنگە مەولەوی لە تەمەنی بیست ساڵیدا و لە ساڵی " ١٢٤١ ی کۆچی مانگی " دا لە خانەگا و لە خزمەت مامۆستا سەید عومەردا خەریکی دەرس خوێندن بوو. هەر لەم ساڵانەشدا موفتی زەهاوی هاتۆتە وڵاتی جوانرۆ و بەینێ لە " عولانی ـ هاڵانی"شاری جوانرۆی ئێستا )دا لە خزمەت مامۆستا مەلا عیسای کلاشی دا ، و بەینێ لە خانەگا لە خزمەت مامۆستا سەید عومەر دەرسی خوێندووە.

ئەم سەرەتایە بۆ ئەوەیە کە بزانین لە چ ماڵێکدا ئاگری ئەوین بەربووە دڵی مەولەوی و ، وەکوو کەو هێنایە قاسپە و وەکوو بولبول هێنایە چریکە و ئەو هەموو شوێنەوارە لە گەنج و جەواهیرات بەنرخترەی لە شوێن جێ ما ؟

زۆر لەسەرخۆ دەبێ بڵێین لە دێی خانەگا و ماڵی مامۆستا سەید عومەر: بەڵێ عیشقی پاک و دوور لە هەوا و هەوەسی

مجلهٔ سروه در مراکز زیر بفروش میرسد :

| شهر | مرکز | نشانی | شهر | مرکز |
|---|---|---|---|---|
| تهران | کتابخانه طهوری | روبروی دانشگاه تهران | مهاباد | کتابفروشی موفقی |
| تبریز | مطبوعاتی ملازاده | تبریز ـ خیابان امام | باختران | نمایندگی اطلاعات |
| ارومیه | انتشارات طاح الدین ایوبی | خیابان شهید باکری | سقز | کتابفروشی محمدی |
| ارومیه | کتابخانه انزلی | خیابان امام خمینی | سقز | کتابفروشی نیما |
| ارومیه | کتابفروشی ترمینال | ترمینال بزرگ | سردشت | نمایندگی اطلاعات |
| سنندج | نمایندگی اطلاعات | خیابان فردوسی | سردشت | کتابفروشی معارف |
| بوکان | کتابفروشی طالحی | خیابان انقلاب | پیرانشهر | کتابفروشی رازی |
| نقده | کتابفروشی خیام | جنب ژاندارمری | بانه | کتابفروشی ناجی |
| روانسر | کتابفروشی خیام | بلوار شهرک | پاوه | انتشارات بیان |
| مهاباد | کتابفروشی خانی | میدان ملاجامی | اشنویه | کتابفروشی نلوسی |
| مهاباد | کتابفروشی حمیدی | خیابان سیدنظام | مهاباد | کتابفروشی جامی |
| مهاباد | مطبوعاتی قربانعلی کریمی | فلکه شهرداری | | |

نەفسانی ( خاتوون رابیعە )ی کچی ماموٚستا سەید عومەر مەولەوی تاواندەوە و خەل و خەوشی لێ گرت و کردی بە زێری خالیس و پاکتاو ، هوٚی ئەم تاوانەوەش ئەوە بوو کە مەولەوی لەم عیشقەیدا شکستی خوارد .
جا ئەو بەرهەمەی کە عیشقی شکست خواردوو دەیبەخشێ عیشقی بە ئاوات گەیشتوو نایبەخشێ .

لەو حالەدا کە ئاگری ئەوینی مەولەوی هاورێ بە شیعرە ئازیزەکانی سەرەنەر دەکا و ، وردە وردە دەکەوێتە گوێی ئەم و ئەو.

دەزانن جەنابی ماموٚستاش وەنەبێ پێی خوٚش نەبێ ، لە ناکاو رەقیبێ بوٚ مەولەوی سەر هەلدەدا و لەسەر خاتوون رابیعە دەبێ بە بەربەرەکانێ ، مەولەویش بەندەی خودا پیاوێکی غەریب و ئەوەلێ دەم و بێ مال ، درێژەی پێ نەدەین رەقیبی مەولەوی کە کورە سەیدێک دەبێ بە ناوی سید نصراللە و لەگەل ماموٚستاش خزم دەبێ ( خاتوون رابیعە ) دەخوازێ و مەولەوی بە هەناسە ساردی لە خانەگا دەر دەچێ .

**ئاخ من و شەوالّ هەردوو هامفەردین**
**هەر دوو گرفتار ئێش یک دەردین**
**عورە غورەی ئەو سەفاش پەی غەیرێ** (1)
**ئازیز قیبلەی من وەفاش پەی غەیرێ**

مەولەوی خاتوون رابیعەی بوٚ نەبوو . بەلام ئەم هەموو شوێنەوارانە بەرهەمی ئەو عیشقەیە کە ئاکامی هاتە سەر شکست

دەلێن سەید نصراللە خوێندەوارێکی باش نەبوو ، بەلام لە خاتوون رابیعە(2) کورێکی بوو بەناوی سەید عنایت اللە کە مەلا چاک بوو ، لە سنە دادەنیشت و بە نیابەتی شێخ الاسلام ئیشی خەلکی دەبرییەوە . سەید عنایت اللە"ش کچێکی بووە بەناوی خاتوون رابیعە کە دەبێتە دایکی جەنابی ماموٚستا سەید حوسێنی مەسعوودی ئیمامی مزگەوتی شافیعی کرماشان . کە من ئەو هەموو زانستە نایابانەم لە خزمەت ئەودا دەس کەوت .

---

(1) : غورەی ئەو قیبلەی من وەیەکتارەن وە نام ئێمە و وەکام ئەغیارەن

(2) : ئەو خاتوون رابیعەیەش وەکوو خاتوون رابیعەی یەکەم خوێندەوار بووە ، ماموٚستا سەید حوسێن دەلێ کە قورئان و وردە کتێبە فارسی یەکانم لە خزمەت دایکمدا خوێندووە.

لە بێکاری ناخۆشتر نیە . ئەویش بە تایبەتی کاتێک کە زگت لە برسان بە پشتەوە بنووسێ و هیچ زەوادی خودا شک نەبەی .جا ئیدی ئەگەر ناوێکی زۆر گەورەشت بە دوای خۆتدا رکێش کرد، وەک فلان کەس دیپلۆمەی بێکارە و لەم جۆرە قسانە...

منیش یەکێک لەوانەم کە بابیان بە هەزار زەحمەت و لالانەوە و پارانەوە گەیاندوونی بە رۆژێک کە دیپلۆم وەرگرن و هێندێک لە جەنابی رەئیس چکۆلەتر لە پشت میزی ئیدارە ئۆقرە بگرن و جا بابە پاڵ داتەوە و بە لێشاو پووڵی بێتە کۆشی .

بەڵام نە تەنیا نەبوومە رەئیس بەڵکوو بە دەرکەوانیش رازیم و ئەویشم نادەنێ . هەڵبەت نەک بفەرموون خودای نەخواستە دیپلۆم بایەخی نەماوە،بەڵکوو لەبەر ئەمەیە کە کار کەمە و لەوەها هەل و مەرجێکدا دامەزران چۆتە پشتی شێران .

دەردی سەرباری هەموو دەردان ژن و منداڵیشم هەیە هەر ئەو رۆژەی کارنامەکەم بردەوە ماڵێ، بابم دەستی کرد بە گریان ، منیش وامزانی لەمن ناڕاحەتە ،بەڵام دوایە گوتی :

- رۆڵە پیاو تا ژنی نەبێ نابێتە پیاو .

منیش لەبەر خاتری ئەوە کە ببمە پیاو دەستم وەڕووی بابم نەهێنا ئەویش کچی دوستێکی خۆی لێ مارە کردم. جا بەراستی"رێوی بۆخۆی لە کونێوە نەدەچوو قانگەلاشکی رکێش دەکرد." دوو ساڵی رەبەق لە کار گەڕام بەڵام ئەو سوار و من پیادە نەیگەیشتمێ .

جا بێپووڵی و نەداری لە لایەک ، خەرجی شیری منداڵی چکۆڵە لە لایەک،دەردی سەرباری هەموو دەردان لۆمە و لەقەبی عالەمێ !

پەنام بۆ هەرکەس دەبرد رێنوێنی دەکردم و نەزەری خۆی دەردەبڕی . منیش پێشنیارەکەی ئەوم بەرێوە دەبرد ، بەڵام پاش ماوەیەک قازانج سەری مایەی دەخوارد و منیش دەگەڕامەوە دواوە .

هەتا رۆژێک تووشی هاوکلاسێکم بووم .دیتم ماشێنی لەبن پێ دایە و ئەوەندە سازە کە مەپرسە . سەرم سوڕما و چاوم بە مۆلەق وەستا . زۆرم پێ سەیر بوو . کوڕە ئەوە هەمزە بە چی وای لێهاتووە ؟

پاش چاک و خۆشیەکی گەرم و گوڕ، حاڵ و باڵی خۆی بۆ گێڕامەوە و ئەوجار زانیم بابە ئەوە چلاوکەبابی بە ئیجارە گرتووە و ئاوا ساز بووە ، بێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ بێ گوتی :

- لەمنت نەکەوێ ! پەلەی مەکە دووکانێکی وەک هیخۆم بۆ تۆش بە کرێ دەگرم .

خودایە چ دەبیسم ،کێچم بە کەوڵی هەڵگەڕابوو،ئارا و قارام لێ هەڵگیرابوو.جارێ حەوتوویەک لە خۆشی دەوڵەمەند بوون خەوم لە چاوی نەکەوت .خەونی سەیر سەیرم بەم هەموو پووڵانەوە

دەدیت، کە دەهاتە دەستم. لە پێشدا ماشێنێکی گەورەم دەکڕی و هەموو بەیانان جیرانەکانم پێ دەگەیاندە نێو بازاڕ.چەند جۆرە مرەبام ساز دەکرد، هەرکەس ئیشتیای لێ با، قاپی دێنا و بۆم پڕ دەکرد، ئەوانەی دەهاتنە دووکانەکەم و پوولیان نەبوو بەسووکایەتیچاوم لێنەدەکردن و نەمدەهێشت شاگردەکانم بە خۆڕایی سەرباوێنە سەر خەڵکی.ئەوانەی لە ئاواییە دوورە شارەکانرا هاتبوون لەبەریان هەڵدەستام و بەکەیفی خۆیان لەگەڵیان دەجووڵامەوە....

بە کورتی دەتگوت بۆی پەیدا کردووم. بەیانان کە لە ماڵ وەدەردەکەوتم هەستم بەوەی دەکرد کە خەڵک جۆرێکی دیکە دەڕواننە من. وادیار بوو هەموو ئیشتیایان لەوەیە کە جارێک بچنە چڵاوکەبابی و بە تێرایی دڵیان بخۆن....

هەتا ڕۆژێک بە ئاوات گەیشتم .دۆستەکەم دیتەوە دووکانی بۆ گرتبووم. بەر لەوە کە هیچم لە زاری بێتە دەر بۆی حیسا ب کردم ،گوتی:

ـ کاکە ڕۆژێ لانی کەم سێسەد کەس دێ و نانی دەخوا. قەیدی ناکە ئێمە دووسەدی حیساب دەکەین، دووسەد چل تمەنی دەکا هەشت هەزار تمەن، دەی جا زۆر باشە، 

بایی ١٠٠٠ تمەن گۆشت دەکڕی و بایی ٢٠٠٠ تمەن برینج، ١٠٠٠ تمەنیش پوولی ئاشپەز و کرێکار دەدەی ،بۆ خۆت هەر پاڵدەوە و پوولی بژێرە، هەموو ئێواران سەعات ٣ی پاش نیوەڕۆیە ٤٠٠٠ تمەن پووڵ بەرەوە. لەوەی ٥٠٠ تمەن پوولی ئیجارەیە و ٣٥٠٠ تمەنیش بۆ خۆت !!!، ئەگەر هێندێکی دیکەی لەسەر ڕۆیبا لەوانە بوو، مانگێک لە خەستەخانە بکەوم...

سەرت نەیەشێ، سەودا سەری گرت و بۆ سبەینێ چوومە دووکان و ئەوجار دۆستەکەشم ئاشپەز و کرێکاری بۆ گرتم و قەسابێکی پێ ناساندم، هەموو ڕوژێ بایی ١٠٠٠ تمەنم گۆشت بداتێ...

دەست بە کار بووم، ڕۆژی وابوو ١٠ کەس ـ ٢٠ کەس، جاری واش بوو دەگەیشتە ٥٠ کەس. دڵم بە گۆشتەوە نەبوو، لە هەموو کەس پترم چێشت تێدەکرد و چێشتەکەشم چەور بوو، ڕۆنی کەرەی خۆماڵیشم دەدا بە مشتەری.

مانگێک رابرد و من بێجگەلە کرێی دووکان ٥٠٠٠ تمەنم سەری مانگێ بۆ ماوە. ئەوجار دەمدی وردە وردە مشتەرییەکان نێو چاوا نیان گرژە ،بۆخۆم لەسەر سەندەڵییەکی چەرخدار دانیشتبووم و لووتم لە حەوای بوو، مەگەر ئەوەی کاری پێم با دەنا دەعیەم نەدێنا کەس بدوێنم.

شاگردێکم هەبوو ناوی کەماڵ بوو، کوڕێکی **ساویلکە**ی بە گوێ.

ئێوارەیەک کە سەرم بە دیوی قاپ شوتندا کرد تەمەشام کرد، ئەوەندەی بەیانی کەبابی بەڵگمان ساز کردبوو نیوەی لە خزمەت کاک کەماڵدایە، بەڵام بە برژاوی ،بۆ وەی لەم کارەساتە حاڵی بم ڕووم لە

کاک کەماڵ کرد و گوتم :

ــ براله ئەوە چیە ؟ئەم هەموو کەبابەت بۆ لە لایە؟

ــ جا چووزانم.مشتەری نەیانخواردووە و منیش لێرە کۆم کردۆتەوە کە چوومەوە بۆ منداڵەکانی دەبەمەوە .

زۆرم پێ سەیر بوو، نەمدەزانی بۆ وایە، چوار رۆژ لە مانگی تازە رادەبرد بەڵام مشتەری لەباتی زیاد کا ئیشکاوی هاتبوو . بۆچی؟

بەڵێ تەمەشام کرد، خەتای کەبابی بەڵگە و هەر کە دەچێتە سەر ئاور ،دەبێ بە قایشی دەللاکان .ئاخر ئەوە شەوە خەوم لێ نەکەوت ، بەیانی دیسان وەختی کار ، کاکی ئاشپەز دەستی کرد بە کەباب ساز کردن دەستم لە گۆشتەکەی دەدا ئەوەندە نەرم بوو بە کاڵی هەڵدەوەری کەوابوو ئاشپەز تاوانبار نەبوو .

نیوەڕۆ دیسان شەش حەوت مشتەری هاتن و کەبابی قایشیان مەیل فەرموو! یەکیان هەستا حەوا و گوتی:

ــ کاکە ئەو بەڵگانە جوان ساز ناکرێن ، ئەمجار لە ئاویان بگرە ، وەخت بوو شاگەشکە بم .بەیانی بایی ٨٠٠ تمەنم گۆشت لە ئاوێ گرت و دوایە هێنامانەوە پێمانەوە کرد، تەمەشام کرد نەخێر ئەوجار هەر تامی گۆشتیشی لێ نایە، بە کورتی گۆشتی ئەو رۆژەمان بەزایە چوو، کابرای مشتەری ویستبووی تۆڵەی ئەم ٤٠ تمەنەم لێ بکاتەوە .

بەڵام خۆ نەدەکرا دەست لەسەر دەست دانێم، ئێوارە وەختی گۆشت چاک کردنێ چوومە چڵاوکەبابی‌یەک و دیتم پۆدری لێ دەدەن ، ئێبدی خەبەرم لەوەی نەبوو کە ئاشپەزەکەشم ئەو فێڵەی دیتۆتەوە .بەیانی بە دزی پۆدرم لە کەبابەکان دا .

ئاشپەزیش دوای من ئەوەندەی دیکەی لێدابوو، ئەو رۆژە هەرکەس کەبابی دەخوارد نێو چاوانی گرژ دەبوو، لووتی هەڵدەقرچاند و دوو سێ جار ملچە ملچی دەکرد و هەڵدەستا حەوا .بە ناقایلی پووڵی بەجێ دەهێشت و بە بۆڵە بۆڵ وەدەردەکەوت.

ئەوەندەم چاو لە زاری مشتەری‌یان کردبوو، ملم خێس بوو، بەڕاستی ئەو دەمە کەیفم سازبوو کە مشتەری بە ئیشتیا دەیخوارد، بەڵام هەرکە یەکێک وەژوور دەکەوت دەیگوت"بەڵگ"،لە پشتێند بەرە ژێرم دەمرد !

بەڵێ ئەوەش چارەی نەکرد ، چارم ناچار بوو ، پەنا بۆ کاکی قەساب بەرم و ڕێگا چارە لەو بخوازم، ئێوارە پاش تەواو بوونی کار لە ماڵی کاکی قەساب وەژوور کەوتم ، ئەوەی من دیتم کەس نەیبینێ .

تەمەشام کرد ، ئەوە کەڵیچەیەکی کوشتۆتەوە و کەوڵی دەکا ، هەموو شتێکم بۆ روون بۆوە،زانیم ئەو گۆشتە پشتەمازەی بە گۆشتی گوێلک بە منی دەفرۆشێ ، گۆشتی کەڵیچەیە و گۆشتی کەڵیچە و پالاخ و هێوەرەش هەتا لەسەر ئاور بمێنێتەوە چیڕتر دەبێ .

بە کورتی ئەگەرچی نیوەی مشتەری‌یەکانم چوون ، بەڵام توانیم چارەی ئەو کارە بدۆزمەوە .

ماوەیەکی دیکە رابرد. خەڵک وردە وردە دەهاتنەوە و منیش کە چاوم لەوە نەبوو یەکدا بە دوو ببمە قاڕوون ، دڵی مشتەریم نەدەشکاند و ئەوەی لە توانامدا بوو، دەریغم نەدەکرد ،

چوار مانگ رابرد ، لەم چوار مانگەدا نزیک بە ٢٠ هەزار تمەنم پەیدا کرد-بوو ،تازە دەهات وردە وردە خۆ بگرم کە ئەوجار دەردێکی دیکە پەیدا بوو،خودا هەڵناگرێ ، ئاشپەزەکەم کارجوان و دەستاوخۆش بوو ، بەڵام سێ چوار رۆژ بوو برینجەکەمان دەسووتا .

بنی پێوە دەنووسا،سەرەوەش بۆنی دەگرت ، دەمویست سەرەدەرێ لەو کارە بکەم بەڵام چم بۆ بەچی نەدەکرا.

ل ٨٣ ←

ئەی ساکینی ریازی مەدینەی منەووەرە
لوتفێ بکە بفەرموو مەدینەی منە و وەرە
(نالی)

روو هەر لەمن ئەپۆشێ، وا حاڵیە کە جبریل
هەر خاسە بۆ من و ئەو ئایەی حیجابی هێنا
(سالم)

چاهی زەقەنلە رێگەوگیسو. دەلیلی دڵ
تۆ سەیری ئەم عەساکەش و ئەم کوێروچاڵەکە
(ئەدەب)

سەنەمێ ژ قەوسی ئەبروو دوو هلال نەو نوماندن
دووکەمان ل بورجێ میزان ب غەزەب لە من کشاندن

نەدونوون قەلەم مقابل ب بەدیع خەت نڤیسین
دوو هلال دەستی قودرەت بە قەرانی یەک کشاندن

ج بەراتی حوسنە یارەب بنشان پادشاهی
ب تەرەف دووتوورە تووغرا وەب ماوەر ێ رەشاندن

ئەلف ولام وهێ دین مەدئایە تا جەمالی
ژجەگەر مەکر تەسەللی ئوژسینە دەست فەشاندن

نەتنێ ژقشت و زولفان مەدسینە سەد کولابن
ل جگەر سیەه کە مانان دووهزار تیررەشاندن

ژ جەگەر " **مەلا** " پولنگان ب گولاب و پەنسیکەرکر
ئەسەدان ژ پەنجە وێران دل و سینە هەرەشاندن

مەلای جزیری

سڵاوی خوالە دیداری محمّد
لە ئال و بەیت چوار یاری محمّد
ئەوەی فەرموویە وا یەنەک هەوایە
بەرو بووی وەحیە گوفتاری محمّد
سەراسەر عورفی ئینسان سازو شەرعە
هەموو فەرمان و کرداری محمّد
هەموو ئەستێرە وەک پێغەمبەرانن
بەبێ پرشنگ لە دیاری محمّد
محمّد بەندەیی پەروەردگارە
رەسوول اللەیە سەرداری محمّد
محمّد گەورەیی پێغەمبەرانە
سوپا سالارە سالاری محمّد
محمّد خاوەنی خولقی عەزیمە
بە قورئانی خودا دیاری محمّد
محمّد هەردەکا هاواری ئیمان
فامنّا بە هاواری محمّد
محمّد رێنوێنی "رێبوارە"
خودایە بمخەیە بواری محمّد
محمّد رێبەری رێگەی خودایە
سڵاوی خوالە دیداری محمّد

رێبوار

## سەیدکامیلی ئیمامی «ئاوات»

# باوەلێ

تەیری دل بێپەرو پوتەپکە شکاویکی بەسە
چاوەریی تویە کەبیی سووکە سلاویکی بەسە

مەلی زستانە جلیپیر وفەقیر پارە بووە
رووژی رووت دەرخەهەتیوتوزەهەتاویکیبەسە

پایزە فەرموو تەماشا کەلانە و خوارم
پیرە کەرویشکی لەگور کەوتەبیراویکیبەسە

ئەوهەموو زولفەبە زنجیریمەکەبومنی پیر
تەیرایوا بێپەرو بالکوتبی داویکیبەسە

سەیدو پیروهەژارم وەرەلیم قەوماوە
بو منە ئەومەسەلە باوەلی باویکی بەسە

وابەسەر رووتی و پیخاوسیها توومە وەلات
(کامیلت) جووتە کەلاشیک و کلاویکی بەسە

---

پایزە
گێژە لووکە و شەڕە بای
ئاشکرا دیارە سروشت لێی زیزە
رەنگ بزرکاوە هەناسەی سەردە
کزە ، ئالۆزە ، بە داخ و دەردە
بێ هەوار جۆلە لە جیغ و رەشمال
دەگەڕێن ئێستە لە جێی وان قەل و دال
پیرە زریان بە کزەی سارد و سڕی
وەک دەڵێن بەرگی فەقیرانی دڕی
لە تەنیشت هەرکەسەوە رادەبرێ
وەکوو دوپشکی جزووی دادەگرێ

هێدی

---

زولفت وەلادە رووت بنوێنە بە دفعەیێ
شەو رابرێ،ئەستێرە نەمێنێ قەمەر هەڵێ
بەو زولفە میووەحەت مەکە مەنعم لەشەهدی لێو
تەیرێکە دڵ زەعیفە دەترسێ لە داوەلێ

( سیف القضات )

---

بازاری دەهرە قیمەتی ئەشیا بە جێگەیە
مێشێ کە نیشتە رووی نیگارێ لە خاڵ ئەچێ

( حەمدی )

---

لەسەر دەشتی مەینەت پەڕەی کزدەوە
کەوانی بەلا لۆکەکەی پەیکەرم
بەلالووکە دەرمانی دەردم ئەویش
بە پارە وەگیر ناکەوێ بیکڕم

( حاجی قادر )

---

# کاکە حەمەی ناری

حوجەتی مولکی لەتیفی خەت وخالی روویەتی
نووری ئیسباتیلەتافەت نەفسی حەلقەی مویەتی

رووەمەتەیا چینییە یالەوحی مینا یا سەدەف
یا بەئاهی سەردی عاشق ئاوە خۆبەستوویەتی

پەرچەمی جەزبەی دڵیکردملەبۆ شوعلەی روخی
رەهبەری ئاتەش پەرەستی توررەیی جادوویەتی

سەیرەخەندەی لێوەکەی بۆدڵ نەوازی چی دەکا
شەڕ فرۆشی گەرچی رەسمی نێرگسی بەدخوویەتی

چاوی مەستی قابیزولئەروا حەلێوی وەک مەسیح
کوشتن وئیحیا بەچاو ولێوی هەرئەو بوویەتی

نەشتەری غەمزەی لەجەرگمدا وبە گریەمپێکەنی
غونچە پشکوتن بەشەونم ،عادەتی پێشوویەتی

دیجلەی سەیلی سروشکم حەدد وپایانی نەما
شاهیدی بێ غایەتی لیتەو قوڕی پێلوویەتی

قامەتی ناری بەکۆڵی میحنەتی واخەم بووە
تەختی پیشانی هەمیشە هەمدەمی زانوویەتی

# بەیت بێژێکی کورد بناسین ...

عومەری رەسوولی

بارگە و بنەی سەفەرمان تێک ناوە و کاروانی وچان نەدەری خەیاڵمان بەرەو هەوارگەی دڵان وەرێ خستووە کەند و لەند و تەپۆڵک و تەلان و چڕی بەرز و نزم و پەستیمان کردۆتە پێخۆری سمی کەحێلان . دەشت و پێ و دەشت و مووچە و مەزرا و مێرگ و مێرغوزاری دڵگیرمان تێپەڕ کرد و بە پەنا رووباری خورێن و ئاو هەڵدێری دڵڕفێندا رابردین .

لەم هەوارە دەشتەدا دووکەڵی خێوەتێکی دوورە دەست بەرەو مەودای بێسنووری ئاسمان رێچکەی بەستووە ، خوارەپێچەی دووکەڵ دیمەنێکی جوان و هەست بزوێنی پێک هێنابوو کە بە تەواوی هەست و بیری بەرە و خۆی رادەکێشا دەتگوت گوڵە لاولاوی باغی بەهارە بەم بێهێزییەوە چناری خەیاڵی سەربەرزی گرتۆتە باوەش و بەژنی لە باڵای ئاڵاندووە ، یا خۆ دەتگوت تەمی هەناسەی دڵی ئەویندار و بریندار ی شەمزینە لە دووری شەمێ ئاهی نامرادی هەڵدەکێشێ. رکێفمان لێدا و خۆمان گەیاندە قەراغ رەشماڵەکە .

لە دوورەوە بە رمبەی سمی حدوود و پڕمە و حیلەی کەحێلان پیاوێکی باڵابەرز و بەهەیبەت و بە خۆوە لە رەشماڵ هاتە دەر و بەرەو پیرمان هات ، خوێن شیرین و رەزا سووک و دڵگەرم و لەسەرە خۆ دەهاتە پێش و هێدی و هێمن دەدوا ، وەک هەموو کوردێکی خاوەن هەست بە نێوچاوانی بێچین و

روومەتی گەش و سوور و دەمی بە بزە و پێکەنین داوای دابەزین و وچان دان و میوان بوونی لێکردین...

پاش سڵاو و چاک و خۆشی. پرسیمان بە دوای شۆڕە سوارێکەوە وێلین کە ئاوازەی هەستی بەتینی تین و گوڕی دیتنی پێداوین. بۆ چاوپێکەوتنی مەودایەکی دوور و درێژمان پێوا وەکوتی:

**- جارێ وەرن پشوویەک بدەن.**

چاوەکانی چاوەڕوانی وەڵامی هاتنە خواری ئێمەی لێدەباری. هیچ دڵێک توانای دڵشکاندنی ئەوی نەبوو. دابەزین.

کابانی قۆڵچاخە لە شان هاتە دەر و پاش بەخێرهاتنی ئێمە گورجێکی لبادی راخست خانەخوێ دڵی پڕ لە پیاوەتی و ساکاری بوو. قەڵشی دەستی پیشاندەری رەنج و کوێرەوەری یەکانی ژیانی بوو، چاوی کز و لە قووڵەوە چووی بیرەوەری مەینەت و تەنگ و چەڵەمەی سەردەمی لاوەتی لێ دەتکا. دەنگی بەسۆزی زایەڵەی دووردەستی شمشاڵی شوانی دەگوێ دەسرەواند.

**- ئەگەر دەکرێ ماوەیەکی تر لێرەبن، راستی ون بووەکەتان کێیە؟**

**- رەسووڵ ناوێکە خۆتان ئاسایی گەلێک دڵ دەوڵەمەندە.**

ماوەیەکی کورت چووە لەبیرەوە و ئاخێکی لە قووڵایی دڵەوە هەڵکێشا و گوتی:

**- جا ئێوە چی و رەسووڵی کوڵۆڵ و دڵ بەگەردا و چی؟**

- بۆ دەیناسی؟

**- بەڵێ چاکی دەناسم، چ کارێکتان پێی هەیە؟**

- چت لێ بشارینەوە، لە قسان گەلێک حەکیم و زانایە و لە دەرمان کردنی برینی دەردەداران ئازایە، دەچینە لای بەڵکوو دەرمانێکمان بۆ بگرێتەوە بۆ چووکەلە سوارێک کە کەوتووە لەبەر بێلایە.

" لەحێلێ، لە دارچینێ- لە خەنێ، لە تۆزی دە شەدێ، لە ژەنگی دەگوارێ، لە ئارەقی قوڵکی گەردنێ با بیهاوێینەوە سەر برینی ئەوێ سوارێ، ئەوساڵ، هەلەکەی گەلێک ناسکە، نەوەک برینی سوارێ مە بچێتەوە پاشێ و بێنێتەوە تەشەنێ.

لەپڕ خانەخوێ پێچە رەشە خاڵ وردە سپییەکەی لادا و دەستێکی لەبەر پشتێندی راکرد و گوتی:

**- هەی سوار رەببی بەدوور بی لە دەردێ لە ئافاتێ لە بەلایە**

**لە رمبی عەولای حەسبۆی**

**وەڵەدی بەرازی**
**لە شەقەی دە ئاوزەنگییان**
**لە پڕمەی دە کەحێلان .....**
**لە ناڵە ناڵی دە کەرەنایە**

نارەی دەنگی بەسۆزی تێکەڵاوی هەوای سروشت بوو. کەژ و کێو و دەشت پڕ بوو لە هاوار ، ئەشکەوت و دۆڵ و تەلان دەنگی دەداوە. گوڵان کەوتبوونە جۆڵلانە و خۆڕانان ، مەلی ئاسمانی هونەر لەنگەریان دەبەست و تەیران شاباڵیان بەسەردا دەکێشا .زەنگوڵ زەنگوڵ فرمێسکەکانی دەڕژانە داوێنی سەوزە گیای دەمکوڵ و بیر و پاراوی بارانی رەحمەتی هەست دەبوون و بە دەنگی پڕ هەستی مەستی مەستی ئارەقی یەزدانی کردین و جامی ئەلەستی داینە دەست. بەدوای ئەودا سەیدەوانی بۆ گوتین و شایی و شینی عەبدول عەزیزە کوڕەی داسنی لەپێش چاومان زیندوو کردەوە و کاکۆڵی سەیدەوانی بە دەم باوە رادەژا دەتگوت ردێنی نێری بەلە بۆزە و لەسەری کوێستانان دەڕوانەوە دیسان گوڵە مێلاق و گەزیزە و گوڵە نەورۆزە.

میری باڵەکانی جواب دەکرد و شەمێی لە شەمزین مارە دەکرد بەشوین ئەوانە لە کاتێکدا دوو دڵۆپ فرمێسکی نەرژاوی لە چاویدا قەتیس مابوو بە گەرمی دەستمان کوشی و لاروومەتیمان ماچ کرد و پرسیمان

– راستی کاک رەسوولێش دەنگی خۆش بووە و بەیت و باو و حەیران و بەندی جوانی هەڵبەستووە ، ئێستا کە ئێوە باشی دەناسن هەتا دەچینە لای هیندێکمان بۆ باس بکە. هەروەها بۆمان بگێرەوە لە کوێ لە دایک بووە و تەمەنی چەندە و ژیانی چۆن رادەبوێرێ

هەرای لە کابان کرد ، چایەکی دیکەشمان بۆ بێنێ و دەستێ پێ کرد .

**" رەسووڵ لە گوندە خشپیلانەکەی سارەوانان سەر بە شارە خنجیلانەکەی مەهاباد لە دایک بووە ، فرچکی بە ساردەکانی سارەوانان گرتووە و هەتا تەمەنی شەش ساڵی هەوای بێگەردی ئەو هەرێمەی هەڵمژتووە و ماسی بچکۆڵەی دڵی لە رووباری تەنکی ئەو گوندە کەوتۆتە مەلە .**

**دوای ماوەیەک چوونەتە گوندی ئامێد ، کە لە جادەی سەردەشت ـ سابڵاغ هەڵکەوتووە ، لەوێش را ئەو ئاوایییەیان بەرەو دێی دەرمان بەجێ هێشتووە .**

**هەڵبەت دوای " اصلاحات ارضی " زەوی و زاری بە چەنگەوە نەماوە و بەرەو شاری پیرە سابلاغ قوناخی کردووە و ئێستاش ماوەی پازدە ساڵە لە سابڵاغ دەژی.**

**لە تەمەنی هەژدە ساڵی ـ یەوە بە هۆی مەیل و عەلاقەیەکی کە بە بەیت و باوی کوردی بوویەتی، لە لایەکی دیکەشەوە سوارچاک و جوان چاکی وڵاتی خۆی بووە و دەنگیشی ناخۆش نەبووە ورده ورده کوتوویەتی ، بەڵام لە تەمەنی هەژدە ساڵی بەم لاوە ، تووشی نەخۆشی بووە ، ماوەیەک بە دەم نەخۆشییەوە ناڵاندوویە . بە سانایی هەتوانی زام و دەرمانی دەردی وەدەس نەکەوتووە و بە شوێن دەوا و دەرمان هەندەران گەراوە ، بەڵام بەداخەوە ژیان بە خۆشی لەگەڵی نەڕەخسا .لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵییەوە هەمیسان دەستی کردۆتەوە بە بەیت و حەیران گوتن و بەند هەڵبەستن و هۆندنەوەیان .**

درێژەی بە قسەکانیدا و گوتی :

**– هەروەها ناوبراو بەیت و بەندی وەک سەیدەوان ، محەممەد حەنیفە،لەشکری ، سوارۆ، ئازیزە ، ئایشە گوڵ، گوڵێ گوڵێ ، سام سام ، سەحەرە، شەم و شەمزینی کوتووە. ئەڵبەت ئەوانەش لە سەید عەوڵای بورهانی فێر بووە. لە سینەی ئەوی وەرگرتووە و لە مێشکی دڵدا تۆماری کردوون و سەید عەوڵاش لە خرناڵ و هەڵکەنی فێر بووە .**

– خرناڵ و هەڵکەتی کێ بوون ؟

– خرناڵ و هەڵکەتی وەک بزانم دوو بەیت بێژی بە ناوبانگی بەر لە ئێمە بوون، دیسان جودا لە وانەش رەسووڵ دەنگی وسێن شەشە، هەبا سەخرە، عەلی سۆفی برایمیشی پێخۆش بووە و باسی حەمە جان و حەمەی بەیتان و ئەوانەش دەکا ، ئەوانەش لەو جۆرە کەسانەن کە بەیت و لاوکان دەڵێنەوە.

مەبەستێکی راستەوخۆ و رووداوێکی قەوماو و کارەساتێکی مێژوویی و یا

جۆراوجۆری سەردەمی ئەو چەشنە رووداوانە لە حاند ئەوان چاویان قووچاندووە . یا خود تۆمار نەکراوە و راستەوخۆ دیاردەی ناکرێتە سەر دەق و نێوەرۆکی راستەقینەکانی کارەسات بەڵکوو هەروا بەیت وێژان سینە بە سینە و زار بە زار وەریان گرتووە و گوێستوویانەتەوە هەتا ئەمڕۆ بەو چەشنە پارێزراون کە دەیانبینین .

گۆرانی شتێکە کە باسی ئەویندار ی و جوانی و جەماڵ و پێ هەڵگوتنێکی گشتی و هەموو لایەنە دەکا ، رەش بەڵەکی پێ دەگەڕێ و کۆڕی لاوان گەرم دەکا ، هەر وەها بە گوێرەی زەمان و ئاڵ و گۆڕی رۆژگار، پێشکەوتی مۆسیقا و ساز و تار و چەنگ و روباب ، ئاڵ و گۆڕی بەسەردا دێ. بەڵام بەیت و باو مەبەستێکی راستەوخۆ و رووداوێکی قەوماو و کارەساتێکی مێژوویی و یا خۆ لێقەومان و زوڵم و زۆری بە شێوەیەکی تۆزێک نهێنی و لەژێر پەردەدا دەکا.

– باشە پێتان وایە کاک رەسووڵ چ جیاوازی‌یەک لە نێوان بەیت و حەیران و گۆرانی و لاوژە بەدی دەکا ؟

– بە بڕوای ناوبراو – گۆرانی شتێکە کە باسی ئەویندار ی و جوانی و جەماڵ و پێ هەڵاّ کوتنێکی گشتی و هەموو لایەنە دەکا و رەش بەڵەکی پێدەگەڕێ و کۆڕی لاوان گەرم دەکا .

هەروەها بە گوێرەی زەمان و ئاڵ و گۆڕی رۆژگار پێشکەوتی مووسیقا و ساز و تار و چەنگ و روباب ئاڵ و گۆڕی بەسەرداد دێ و داهاتووە بەڵام بەیت و باو باسی خۆڵێقەومان و زوڵم و زۆری بە شێوەیەکی تۆزێک نەهێنی و لەژێر پەردەدا دەکا .

٧ بۆوێنە قەڵای دمدم ، یا باسی ئەوینێکی بڵێسەدار و گەشەداری ئاسمانی ئەویندار ی بەناوبانگ و ئەفسانە ئاسا وەک لاس و خەزاڵ و مەم و زین و شەم و شەمزین یا بەسەرهاتەکانی دیکە وەک برایم و مەحمەڵی دەشتیان ، سەعید بەگ و میر سێوە دین و سوارۆ و باقی‌تر ....کە هەر یەکەی بە نۆبەی خۆی جێی باس و راوێژی جودای هەیە .

-نووسەران بە پێی بەڵگەی

بۆ جارێکی تر سپاسمان لێکرد و ئیزنی رۆیشتنمان لێ خواست ، چونکە جار .دەگەڵ جار تینووی دیتنی کاک رەسووڵی دەکردین، هەرچەند پێمان خۆشبوو کە زۆرتر لەلای بین . چونکە بەراستی ئەویش بۆ خۆی مامۆستایەک بوو .

گوتی :

– جا ئێوە بە خودا دەسپێرم ، هیچ حەوجێ بە دیتنی رەسووڵی نیە چونکوو رەسووڵی مینایی بۆ خۆمم.

دیسانیش سوپاسمان لێکرد و بە هیوای دیتنەوە و چاوپێکەوتنەوەی

ئەحمەدی شەریفی

# بەرگوێنێک لە خەرمانی گۆرانی کوردی

(بەشی دووەم)

ئوستانی کوردستانی ئێران نزیکەی ٢٥ هەزار کیلۆمیتری چوار گۆشەیە ،لە رۆژئاواوە لە زنجیرە چیاو لێرەوارەکانی بەینی بانە و سەردەشتەوە هەتا زنجیرە چیای شاهۆ و بەرزاییەکانی هەورامان دەگرێ و لەگەڵ کوردستانی ئەو دیو هاوسنوورە و لە شیمالەوە لە لێژەکانی بانە و چیای وەنەوشەوە بەرەو ناوچەی فەیزوڵلا بەگی و بۆکان دەکشێ و تێکەڵاوی خاکی موکریان و ئوستانی ئازەربایجان دەبێتەوە. لە جنووبەوە زنجیرە چیاو بەرزاییەکانی هەورامان و جوانرۆ و شاهۆ بەجێ دێڵێ و بە پشت چیای ( پەرۆ ) تێکەڵ خاکی باختەران دەبێتەوە لە رۆژهەڵاتەوە واتە لە داش بلاغ و قوروەوە هەتا سوورە بەردی بیجاڕ گەرووس هاوسنوورە لەگەڵ ئوستانی هەمەدان و زەنجان .

ناوەندی ئوستانی کوردستان شاری سنەیە ، ئەم شارە لە ساڵی ١٠٦٤ ی کۆچی مانگی لە لایەن سولەیمان خانی ئەردەڵانەوە لە دەورانی سەفەوییەدا ئاوەدان کراوەتەوە وشەی "سنە دژ" بە مانای قەڵای کۆن یا قەڵای خۆرە. قەڵای سنە رەنگە یەکێک لە کۆنترین قەڵاو ناوەندەکانی شارستانیەت بووبێ و ئێستاش کەم و زۆر شوێنەواری هەرماوە .

بەڵام لە باری زمان و دوان و زاراوەوە دەبێ ئەم هەرێمە بە (٧) کەرت بەش بکەین :

**( ١ ) زاراوەی گۆرانی:**

ئەم شێوەیە لە دزڵی مەریوانەوە هەتا بناری زنجیرە چیای شاهۆ دەگرێتەوە ، واتە باریکەیەکی تەسکە بەرە و زوربەی خەڵکی ئەم ناوچە تەسکە ، هەورامین و بە شێوەی گۆرانی قسە دەکەن ، هەتا نزیکەی (١٠٠) ساڵێک لەمەوبەر نفووز و دەسەڵاتی زاراوەی گۆرانی لە ناوچەی سنەدا زۆر بەربڵاو بوو و تەنانەت زمانی ئەدەبی هەموو خەڵکی مەریوان ـ سنە ـ کامیاران ـ بیجاڕ و ناوچەی تەختی ـ سولەیمان و دیواندەرە بووە ، بەڵام بە هۆی گەشانەوەی شێوەی سۆرانی و یەکگرتوویی زمانی کوردی ئەمڕۆمان ، زاراوەی گۆرانی پاشەکشەی کردووە و خۆی دە بناری چیای شاهۆ و دالاهۆ کوتاوە . زوربەی هەرە زۆری شوێنەواری ئەدەبی وەک شیعرەکانی ئەحمەد بەگی کۆماسی بێسارانی و مەردووخی کوردستانی و کتێبەکەی دوکتۆر سەعید خانی کوردستانی بە ناوی"مزگانی " هەر بە زاراوەی گۆرانین. با ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە تەواوی شوێنەواری دینی و مەزهەبی و ئەدەبی ،ئەهلی هەق ـ کاکایی و یارسان هەر بە شێوەی گۆرانین . شێوەی گۆرانیش کە ئێستا

له تەسکه بەرێکی ناوچەی سنەدا ماوەتەوە لە حاڵی گۆڕاندایە و بەرەو زمانی یەکگرتووی کوردی دەڕوا ، ئیتر خەڵکی گوندی بێساران وەک مەلای بیسارانی گۆرانی کۆن و بە بۆن نازانن و قسەی پێ ناکەن . جا هەر ئەم گۆڕانە کە بە هۆی بار و دۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی مەڵبەندەکەوە پێک هاتووە کاری کردۆتە سەرباری گۆرانی کوردیش . گۆرانییەکانی ئەم ناوچە تەسکە ئەگەر چی زۆریان دەگەڕێنەوە سەر شێوەی هەورامان بەڵام بۆن و ڕەنگ و ریتم و ئاهەنگی کوردی یەکگرتوویان زۆرتر پێوە دیارە ، لە ناوچەی ژاوەرۆ و دزلێ ـ بێساران و کەڵاتەرزان و چەمی شامیان و هەجیجدا سەرەڕای ئەوەی کە سیاچەمانە و کنالەیل و (حاجی مەریەم) و (غەریب مەڕ ۆ) و (کەومەل)و ( شیرین دا مەچۆ) یان پێ خۆشە و لایان باوە بەڵام زۆرتر و بە تایبەتی بەرەی نوێیان حەز لە گۆرانی نوێی کوردی یەکگرتوو دەکەن.

لەم هەرێمە و لە هەورامان دا گۆرانی هەرە باو و بە ناو بانگ سیاچەمانەیە بە سێ ئاهەنگییەوە .

سیاچەمانە ڕووداوێکی ناخۆش و کارەساتێکی دڵتەزێنە کە لە دەورانی سەفەوییە دا رووی داوە " کاتێ سەبارەت بە گۆرانی هەورامان دوام بە وردی لەسەر سیاچەمانە و خاتوو کڵاو زەڕ قارەمانی ئەم رووداوە قسە دەکەم "

لەم هەرێمە دا هەم وشەی بەزم و هەم وشەی گۆرانی بە کار دێنن و بە هەر دوو زاراوەی سۆرانی و هەورامی قسە دەکەن و گۆرانی دەڵێن .

**( ٢ ) ـ شێوەی ئاخاوتنی سەر بە کوردی کرماشانی :**

قەڵەمڕەوی ئەم بن لەهجەیە لە ئوستانی کوردستاندا زۆر تەسکەبەرە و لە ناوچەی بیلوار لە قەڵای قەیسیوەندەوە لە پشت زنجیرە چیای(پەڕۆ ) کە لە راستی دا کلکەی چیای شاهۆیە بە رووکاری کامیارانەوە دەست پێ دەکا و هەتا داوێنی بەرزاییەکانی چیای ئەلوەند لە نزیک ئەسەد ئابادی هەمەدان دەگرێتەوە ، ئەم بن لەهجەیە ئێستا لەبەرەوە خەریکە بەرەو سنەیی دەچێ و دێ کە خۆی بکوتێتە پاڵ زمانی یەکگرتووی کوردییەوە .

دەتوانین گۆرانییەکانی ئەم بن لەهجەیە بە رابێتێک لە بەینی شێوەگەلی سنەیی و کرماشانی دانێن و خەڵکی ئەم ناوچەیە هەر وەک هۆرەی جافییان پێ خۆشە بە تامەزرۆییشەوە گوێ دەدەنە گۆرانییەکانی سنە و کرماشان . بەڵام زوربەی گۆرانی بێژان و بەزم چڕانی مەڵبەندە بەرتەسکەی کە من دیومن بە شێوەی سنەیی بە بن لەهجەکەی خۆیان گۆرانییان گوتووە .

با لێرە دا ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە لەم هەرێمەدا وەی گێڕان و شین گێڕان بۆ مردوو لە لایەن ژنانەوە زۆر باوە و ژنی وەی گێڕ و شین گێڕی زۆر بەناوبانگ لەم مەڵبەندە دا دەژین . وەیگێڕان و شین گێڕان خسوسیاتێکی تایبەتی هەیە و بەم چەشنەی کە من لێرە دیومە دەبێ باو و رەسمێکی زۆر کۆنی کوردان بێ کە وا لەم ناوچەیەدا ماوەتەوە .

**( ٣ ) ـ زاراوەی سنەیی و شێوەی گۆرانی کوتن :**

من زاراوەی سنەیی بە شێوە یا لەهجەیەکی تایبەتی نازانم و پێم وایە ئەم شێوەیە جگە لە هێندێک وشە و " زاراوەی " تایبەتی ناوچەی ئەردەڵان لە ئەسڵدا هەر سۆرانییە و کەمێک گۆڕانی بە سەر داهاتووە ، ئێستا شێوەی ئاخاوتنی سنەیی بۆتە زمانی شارەکانی قوروە ـ دێ گولان ـ بیجاڕ ـ کامیاران و تا رادەیەک دیواندەرە.لە بارەی گۆرانی گوتنەوە دەبێ بڵێین کە زوربەی هەرە زۆری ئەم گۆرانی بێژانەی کە وا شوێنەواریان لێ بەجێ ماوە یا هەیانە تێکرا.هەر

بە شێوەی ئەدەبی و یەکگرتووی کوردی•گۆرانی یان گوتووە . تەنانەت گۆرانی بێژێکی بە ناوبانگ و هەڵکەوتەی وەک سەید عەلی ئەسغەری کوردستانیش هەر بەم شێوە گشتییەی گۆرانی گوتووە .

**( ۴ ) شێوەی سەر بە ئاخاوتنی هەوشار :**

ئەم لەهجەش لە قەشلاغی پشتی سەڵەوات ئاواوە بەرەو بیجاڕ و گەڕووس و لە چیای ماموخەوە بەرەو حوسێن ئاوا و بەرزاییەکانی بایەنچۆ دەست پێ دەکا و لە بیجاڕەوە هەتا نزیک زەنجان دەچێ و لەوێوە بادەداتەوە بەرە خاکی هەوشار و تەختی سولەیمان و هۆبەتوو هەتا چاپان دەگرێ، و لە بایەنچۆوە بەرزاییەکانی رووکاری دیواندەرە و کۆماسی دەتەنێ و لە سوونەتەوە بەرەو چاپان دێتەوە.شێوەی دوانی( دانیشتوانی ئەم ناوچەیە زۆر لێک نزیکە ) ئەو شێوە دوانەش زۆر لە موکریانی نزیکە و دێ بە تەواوی خۆی بە دەستەوە دەدا و رواڵەتی " موکریانی " بە تەواوی بەسەردادێ ، لە بارەی گۆرانی گوتنەوە دەچنەوە سەر شێوەی موکریان و لەم هەرێمەدا بە تایبەت لە ناوچەی هۆبەتوو دا دیاردەی بە یتی کوردی بەدی دەکرێ و رەنگە رۆژگار و زەمانێک زۆر بە یتی کوردی لەم هەرێمەدا بووبێ کە ئێستا ناوی هێندێکیان لە بیر ماون ، وەک بە یتی وسێن چاپانی کە ئاوا دەست پێ دەکا :

میرزام رەنجبەر، میرزام رەنجبەر
دارێکمان نیاوەبە خوێنی جگەر .....

**( ۵ ) زاراوەی سەقز**

مەڵبەند و هەرێمی دەسەڵاتی ئەم زاراوەیە زۆر تەسکە بەرە ،لە چاپانەوە بەرەو ناوچەی ئەحمەدی کۆر لەو لاوە هەتا سەر شێوی سەقزە و خوسیاتێکی تایبەتی لەم بن لەهجە دا نیە و دەتوانین زاراوەی سەقزی بەپردێک لە نیوان سنەیی و موکریانی دابنێین و لە باری گۆرانی گوتنەوە تەواو تەسلیمی موکریان بووە و بەرەو زمانی یەکگرتووی کوردی دەڕواتە پێشەوە .

**( ۶ ) ـ ئاخاوتنی بانە :**

شێوە دوانەکەی بانە لە ئالانی سەردەشتەوە بەسەر سنووری دوولای کوردستاندا هەتا زنجیرە چیای چل چەشمە نزیک مەریوان ، هەروا لە لێرەوارەکانی ئالان بەرەو ناوچەی گەورکی سەقز بە داوێنی چیای وەنەوشەدا تێکەڵ بە خاکی بۆکان دەبێتەوە .لەم مەڵبەندەدا جگە لە هێندێک زاراوەی تایبەتی ، شێوەی دوان هەر بە تەواوی موکری یا باشتر بڵێم شێوەی یەکگرتووی کوردی یە و لەباری گۆرانی گووتنەوە گۆرانی ئەم ناوچەیە و گۆرانی زمانی یەکگرتووی کوردی جیاوازی یەکی زۆریان نیە .

**( ۷ ) ئاخاوتنی مەریوان:**

ناوچەی دەسەڵاتی ئاخاوتنی مەریوانی لە زنجیرە چیای چل کانی هەتا دەربەندی دزڵی و لەسەر زێی زرێوار و باشماغ و بایەوەوە هەتا کەلی گاران لەسەر رێگای مەریوان-سنەیە . لە تەواوی ئەم هەرێمەدا دوان و ئاخاوتن و گۆرانی گوتن هەر دەگەرێنەوە سەر شێوەی یەکگرتوو

---

ئەترسم بمرم ژێر قەبرم غاربێ
ئێزراییل لە دەس نالەم بێزار بێ

---

ئەنگوستیلەکەت نقیم گەردە روو
نە من ژن دێنم نە تۆ بکە شوو

---

ئەڵێن لە بانە شەدە هەرزانە
شەدە قابیلی بالا بەرزانە

ئەو بالا بەرزە ، لێو بە خاڵەوە
زوڵفی دا بە دەم بای شەماڵەوە

ئەمشۆ چەن شەوە تالار بێ نازە
نە کزەی کەواو نە دەنگی سازە

---

ئەگریجە وێنە شۆمار زوڵمانی
گەردەن سەر ئاوێز تەختە پیشانی

---

ئەبرۆ چون کەمان چێو گەل چەمیدە
چ خاس هاوەردەن لەداری دیدە

---

پیتی "ب"
بۆچ ئەمکوژی بەعیشووەی چاوی بازت
بەینێکە من بوومە مەحرەمی رازت

---

بۆچ ئەمکوژی بەعیشوەی چاوەکانت
شێتی کردوم پەرچەمی پەرێشانت

---

بەختێ لە ئەزەڵ سیا چارەبێ
دەستی لێ مەدەن با ئاوارەبێ

---

بە وێنەی ئاهووبیرە بیرە خۆم
هەر شەو لەلایێ مەنزڵ گیرە خۆم

---

بانەت بۆ گەڕام تادار و بێ دار
دەنێرم بۆت بێ گۆی زەنجیرەدار

---

بیکە بە خاتر دایکە پیرەکەت
بێ دەرم بێنە لە زنجیرەکەت

---

بابچینە سەر وەیس بۆ تۆبە کاری
تۆبە لە گشت شتێ نەک لەدڵداری

---

بە کۆسەی هەجیج وە شاخانەوە
داختها وە بان گشت داخانەوە

---

پیتی "ت"
تاکەی دانیشم لە سای داری بی
تاکەی بچێژم دەردی غەریبی

تۆ خوا تۆ مەڕۆ فرمانم پێتە
هەرچی تۆئێژی سەرم لە رێتە

---

پیتی "چ"
چاوم چاوەڕێی ئەو دەرک و بانە
کەی لە ماڵ دەرچێ پەرچەم رێحانە

---

چاوم چاوەڕێی کلکەی ئاوایی
داخۆ کەی بێتەو یارم لە شایی

---

چارەکە چەرمگ بەریەقەکەتان
وادەی من و تۆ حەوشەکەی خۆتان

---

چەن شاران گەڕام ، چەن خاکە ساری
بووم بە شوانەکەی حەق نادیاری

---

پیتی "د"
دیسان بارانە نمنم دایداوە
ئەگریجەی لە سەر گۆنای دەخولاوە

---

داخێ لە دڵمە ، لەیل سیا پۆشە
شایی و زەماوەند بێ ئەو ناخۆشە

---

دەمەگری مەگری بۆ لووتەوانە
ناردوومە بۆت بێ لە شاری بانە

---

دەرووئم کەیلە ، دە با لەیل بێ
هەر خەتای خۆمە ماڵم کاول بێ

---

پیتی "ر"
دەردم ئاوێتەی دەردی فەرهادە
منیش وەک فەرهاد رەنجم بەبادە

---

راهزەنی قاتڵ رای راویان مەچۆ
ئەی هاوار هەی داد ئەی فریاد مەچۆ

---

پیتی "س"

سەوزەڵێ و سەوزە ، مەڕۆ لە دواتم
هێشتا نەمدیوی عاشقی بالاّتم

---

پیتی "ش"

شیرینە سەوزە ، دانەی هەناری
کیژە جوانەکەی نێو کوردەواری

---

شەرت بێ لەداخت تەرکی دنیا کەم
کەشکۆڵ هەڵگرم ، عەستا پەیا کەم

---

شەرت بێ گوڵی کەس نەکەم بەبۆوە
تا گوڵم بۆدێ لە خزمەت تۆوە

---

شەرتی دڵداری خەیلێ کەس کەردەن
هیچ کەس وێنەی من بۆ تۆ نەمەردەن

---

پیتی "ک"

کێوی ئاربابا شارەکەی بانە
جوانێ مەڕۆ دڵ بۆتۆ حەیرانە

---

کانێکەی بەرماڵ حەوشا کار ئەکا
قورعانێ بێنە ئەو کچە بار ئەکا

---

کوێستانان خاڵ خاڵ بەفری ناچێتۆ
قیبلەم تۆراوە ئاشتی نابێتۆ

---

پیتی "گ"

گەردن مراوی کەنیل وەک بلوور
خۆ من حاکم نیم راتکێشم وەزوور

---

گەردەن سوراحی شاخی زەڕ مەچۆ
سەر سەوزو بۆرچین پڕشەتاو مەچۆ

---

گوڵی زەردو سووری سلەمان بەگی بانە
بەوێنەت نیە لەو رووی جیهانە

---

پیتی "ق"

قەورم بۆ کەنن یەک کێلم بەسە
گشت شینم بۆ بکەن مەیژن بێ کەسە

---

پیتی "ل"

لە کۆت و زەنجیر دەو لەت ناترسم
بۆ مەلو ولێکەت ئەحواڵ ئەپرسم

---

پیتی "م"

مەڕوانە رەنگم ، رەنگم هەرواسە
بڕوانە دڵم ئێژی پەلاّسە

---

پیتی "و"

وەبەرزی بالاّت گوڵم کردوە کۆ
جەشنم لێ شێویا لە دوور بالاّی تۆ

---

وەقوربانت بم دەم نوقڵە کوردی
رەحمەت وە و دایکەی پەروەردەی کردی

---

پیتی "ه"

هەی داد هەی بێداد دەردم تاوتاوە
ساتێکم لەرزە ساتێکم باوە

---

هەسارەی ئاسمان گشت جەم و جوورە
هەسارەکەی من کەم شەوق و نورە

---

هەڵکێشە خەنجەر بیدە لە جەرگم
ئەوسا بخوێنە یاسینی مەرگم

---

هەی داد، هەی بێداد مەگەرمن گەورم
لە دەرگای خۆتان هەڵقەنن قەورم

---

هەڵسە بێرە لام لەجێی گش کەسم
تۆی هێزی ئەژنۆم، دار عەسای دەسم

# ئێمە و خوێنەر

بە بڵاوبوونەوەی دوو ژمارە لە گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی سروە زانا و ئەدیبەکان،شاعیرە لاوەکان، ئەدەبدۆستەکان،ئەوی دەستی قەڵەم دەگرێ،ئەوی چاوی سۆمای خوێندنەوەی هەیە، بە کورتی هەموو ئەوانەی لە خزمەتی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیدان ،یا ئەوانەی بە ئاواتی گەشەکردن و پەرەگرتنی زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردین پێشوازی ـ یەکی گەرم و گوڕیان لێکرد و بە ناردنی شیعر و پەخشان و نامەی جوان و شیرین هەستی خۆیان بەرانبەر بە سروە دەربڕی .

لە سروەی ژمارە دوو دا بەشێک لەو پێشوازییانەمان بڵاو کردەوە .بەو نیازە بووین لەم ژمارەشدا لاپەڕێک بۆ ئەو شیعر و نووسراوانە دابنێین کە بەم بۆنەوە ناردراون. بەڵام بەڕاستی توانای ئەو کارەمان نیە .ئەگەر بمانەوێ تەنیا بەشێک لە هەر شیعر و نامەیەکی ئەدیبانەی خوێنەرە دڵسۆزەکانمان بڵاو بکەینەوە خۆی نیازی بە گۆوارێکی جیاواز هەیە .

کەوابێ لێرەدا تەنیا ناوی ئەم خۆشەویستانە بڵاو دەکەینەوە .خودا دەست بە عومریانەوە بگرێ،لە ڕێگای خزمەت بە زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیدا سەرکەوـ تنیان بەئاوات دەخوازین..

**سەقز** : ماموستا مەجەلالی شافیعی ،ماموستا مەلا مەحموودی ابن الخیاط ،کاک حامیدی شافیعی ، کاک سەید ئاغا مەحەبەت ، کاک خالیدی ساڵح نیژاد ، کاک ئاسۆمرادی ، کاک محەممەد حوسێنی غەففاری .

**سنە** : میرزای هەورامی کاک محەممەدی ئاسنگەر ، کاک سیروان هەورامی ،کاک ش.ع .

**بۆکان** : کاک ئیرەجی ناهید ، کاک مستە فائیلخانی زادە .

**نەغەدە** :کاک دیاری مەحموود غەفووری .**مەحموود ئاوای بۆکان** :ماموستا غەمبار ماژگەیی . **سەردەشت**: کاک سمایلی محەممەدیان .

**مەهاباد** :کاک ڕەزا خەمبار

**شنۆ** : کاک عبداللەشارویرانی

**پیرانشار** :کاک قادرپیرمرد

**گوندی سلۆکی مەهاباد** :کاک عەزیزی ئازاد .**دزلێ** :کاک ڕەئووفی مەحموود پوور.

**ناوچەی جوانڕۆ** :کاک عارفی فەتتاحی .**گوندی جەڕانی پیرانشار** :ماموستا مەلا عومەری چەختی .**ئیسلامئابادی ئالان (بێژوێ)** :کاک محەممەدی شەریعەتپەنا .**گوندی قەرەگوێزی بۆکان** :کاک ڕ . سووتاو .**گوندی بێمزورتێی شنۆ** :کاک سەید محەممەد ئەمینی واژی .**تەورێز** :خوشکە فەریبا نەوجەوانی .**سمنان** : کاک ئەمین . **ئەهواز** :کاک عومەری کوردستانی و هاوڕێیانی . **جەبهەی ئەندیمشک**: کاک سەید مستەفا شێخ زادە . **جەبهەی سۆمار** :کاک محەممەدی پیر وەیسی. **تاران** :کاک محەممەدی قەهوەیی .**ڕەشت** : کاک حسام الدینی نەهری .

**ئەهواز** :کاک برایمی سەعیدی .**کەرەج** :کاک قەهرەمانی وڵاشی . **لەندەن** : کاک دیاری هەورامانی . ، **ستۆکهۆڵم** :کاک ف . چالاک **بڕلەنی ڕۆژئاوا** :کاک ئارام مەهاباد : **کاک عبدالقادری کەریمی**

ئەگەر لەباتی وەرگێڕان چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیمان بۆ بنێری پێمان وایە پتر خزمەت دەکەی وئەمکارەشت باشتر بۆ دەکرێ .

سەردەشت : **کاک خالید سەبباغی**

نامە و وێنە جوانەکانت گەیشت سپاستان دەکەین

میاندواو : **کاک ناسری سالمی**

لەسەر تکای ئێوە و زۆر خوێنەری دیکە ، ئێمەیش ئاواتە خوازین بتوانین سروە بکەینە گۆوارێکی مانگانە . دیارە ئەوکارە نیازی بەئیمکاناتێکی پتر هەیە .

مەهاباد : **کاک ج.م. ، شەمزاو**

تکایە بۆمان بنووسە قەرار بووە نووسراوەکەی چاپ بکرێ و نەکراوە ؟

پیرانشار :**کاک عەلی نەبیپوور**

بە وتەی نووسەر بووکەبارانە پێش لەهاتنی ئیسلام لەنێو کورددا باو بووە و لە دوای ئیسلام کە بە گوناە دانراوەونوێژەبارانە جێگای گرتۆتەوە .ئەمەش کارێکی بە عەرەب بوون یا کورد نەبوونی پێغەمبەری ئیسلام (دخ) نەداوە .

ئیسفەهان:**کاک رەحمانی هاجەرپوور**

باشترین رێگا بۆ فێر بوونی زمان و ئەدەبیاتی کوردی خوێندنەوەی کتێب و گۆوار و رۆژنامە بە زمانی کوردیە.هیوادارین گۆواری سروەش بتوانێ لەم رێبازەدا یارمەتیتان بدا .

سنە : **خوشکە ئەختەری عەلەوی**

زمانی سروە لە ئاست ئەو هەموو رێز وسپاسە لاڵە . هیوادارین بتوانین بەو جۆرەی شیاوە لەخزمەت فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیدا بین . ئێوە بە هاورێیەکی باشی گۆوارەکەمان دەزانین .بە هیوایەن دەنگی سروە بە ژنانی کورد بگەیەنی .

ستۆکهۆڵمی سوئێد :**کاک چالاک**

هیوادارین سروەبتوانێ وەڵامدەری هەموو ئاواتە پیروزەکانت بێ بەڵێ جگە لە گۆواری سروەکتێبی بەنرخیش بلاو دەکەینەوە . ناوی ئەم کتێبانە لە گۆوارەکەدا راگەیەندراوە و لەمەوداوش رادەگەیەندرێ بە نووسینەکەتدا دیارە خاوەن قەڵەمی . تکایە لەم بارەشەوە زیاتر ، یارمەتیمان بدە .

سەقز :**کاک ئەحمەدی شوکری**

چاوەروانی گەیشتنی بەرهەمی دیکەی ئێوەین ، بەتایبەتی پەندە کوردیەکان .

پیرانشار :**کاک صلاح الدینی فەتتاحی**

تکایە نوسخەیەک لە نووسراوەکانتمان بۆ بنێرە ، تا نەزەری خۆمانی لەسەر دەبرین .

بانە : **کاک عطاءاللە قازی زادە**

لە شیعری مامۆستا حەقیقی دا ،"عەیسیان بەوێ و فووری" هەروەک ، نووسراوە دروستە.یانی "عەیسیان ئەوەندە زۆربووە " بەڵام رەخنەی ئێوە لەوشەی موتاع بەجێ یە و موتیع دروستە هەڵە لە چاپدا یە ، بەداخەوە دیوانی تەواوی حاجی قادرمان لە لانیە تاکوو شیعری ئەو عارفە پایە بەرز لەنەعتی حەزرەتی موحەممەددا بڵاوبکرێتەوە .

کەرج :**کاک موحسینی سەدیقی**

هیوادارین لە کۆکردنەوەی شیعرە چاپنەکراوەکانی مصباح الدیوانی ئەدەبدا سەرکەوتووبی . لەو پارچە شیعرەیدا کە بۆت ناردبووین شیعری ، دووەم و چوارەمی بۆ ئێمە ساغ نەکراوە ،بۆیە چاپمان نەکرد .ئەگەر دەکرێ ساغ کراوەی ئەو غەزلەیا هەر شیعرێکی ئەدەبمان بۆبنێرە سپاست دەکەین .

گوندی قازلێلی بۆکان: **کاک سەلامی سوارە**

هیوادارین لەهونەری وێنەگەریدا سەرکەوتووبی ئەگەر لەبەر هەمەکانی خۆت ئێمەش بێبەش نەکەی سپاست دەکەین .

**میاندواو :کاک ناسری مەعرووفی**

لە سەر داوای ئێوەو زۆر خوێنەری دیکە بریارمان ، داوە فەرهەنگۆکی ٤ژمارەی سروە وەکپاشکۆی چوارەمین ژمارەی سروە لە چاپبدەین چاوەروانی ئەم فەرهەنگۆکە بن کە خوا یاربێ لەگەڵ سروەی ژمارە ٤ بلاودەکرێتەوە . لێرەدا داوا لەئێوە و هەموو خوێنەرانی سروە دەکەین کە ئەو وشانەی بەلایانەوە نامۆیە دەربێنن و بۆمانی بنێرن تا لەم رێگاوە هاوکاریان کردبین

باختەران : **کاک ی. ، محەممەدی**

خوێنەری سروە لە هەر شارێک بێ دەتوانێ پوولی ئابوونمانی گۆوارەکە بدا بەوژمارە حیسابەی کە لە پشتەوەی فورمی ئابوونمانەدا چاپکراوە پێویست ناکا خۆی بێتە ورمێ حیسابی ئێمە لەبانکی سپەهدایە بەلام دەتوانن پوولی ئابوونمان بە هەربانکێکی دیکەشدا بنێرن .

سەقز:**کاک محەممەدی سەدیقی**

برای بەرێز هەموو هەست بەم دەردە دەکەین هیواداریین تۆ دەرمانتپێ شک بێ،ئەگەر بۆمان بلوێ مقالەکەت لە ژمارەکانی داهاتوودا چاپ دەکەین.چاوەروانی گەیشتنی نوسخەیەک لە کتێبەکەتین.

بۆکان :**خوشکەماریە رەحمانی**

وێرای سپاس ئامادەی وەرگرتنی نووسراوەکانتین .

تەورێز :**کاک فەرهادی ئێرانی**

لەسروەدا لاپەرەی تایبەت بە لێکدانەوەی کارەساتە مێژوویی یەکانی کوردستانمان هەیە و هیوا دارین بە یارمەتی ئێوە و خوێنەرانی دلسۆزی دیکە لە ژمارەکانی داهاتوودا هەموو ئەو رووداوانە بخەینە بەر باس چاوەروانیگەیشتنی کورتە چیرۆکە کەتانین .
رەخنەی ئێوە لەسەر رێنووسیش کاتی خۆی بلاودەکرێتەوە

مەریوان :**کاک جەلیلی ئازادیخواز**

وێنەکەت گەیشت .سپاست دەکەین . ئێمە نەک هەر هەوڵ نادەین بە لەهجەی ناوچەیەکی دیاری کراو ، بنووسین ، بەڵکوو تێدەکۆشین هەموو نووسراوەکان بێنینەسەر زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی .

لە سەر بەکارهێنانی پیتی "ص" لەوشەی "طلاح الدین "دا جارێکی تر باسی رێنووس لەسروەی ژمارەیەکدا بخوێنەوە

بەلای ئێمەوە بەکار هێنانی وشەی بێگانە بۆ ئەوشتانەی لەکوردیدا ، هاوتایان نیە لە وشە داتاشین باشترە .

مەهاباد :**عەزیزی محەممەدیان**

ئێمەش لەسەر بڕوای ئێوەین.سەرنجێکی ئەم بەشەی گۆوارەکەمان ( ئێمە و خوێنەر) پێمان دەسەلمێنی کە بۆ وەلام دانەوەی هەستی دلسۆزی ئەو هەموو خوێنەرە بەرێز و خۆشەویستانەمان دەبێ گۆواری "سروە"بکەین بە مانگانە .هیوادارین زۆری پێ نەچێ ئەم ئاواتەمان بێتە دی . انشاالله

سنە :**کاک سیاوەشی ئەردەلان**

وێرای سپاس ،هیوادارین کە ئێوەیش وەک خوێندکارێکی رشتەی کشت و کاڵ ،بە هاوکاری دۆستانوماموستایانی خۆتان لەسەر ئاژەلداری و کشتوکاڵ و بابەتەکانی دیکەشتمان بۆ بنووسن و بەشێک لەم ئەرکە گرانە وەئەستۆ بگرن .

نەغەدە: **کاک یووسفی رەسوولی**

بۆ فێر بوونی لەهجەی هەورامی دەبێ ماوەیەک لەو ناوچەیە بمێنیەوە ،دیوانی مەولەوی و شاعیرانی دیکەی هەورامان بخوێنەوە ، یارمەتیتان دەدا . دەرگای ناوەندی بلاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و باوەشی ماموستا هێمن بۆ هەموو کوردێکی ئەدەبدۆست ئاوەلایە .

سمنان: **کاک بەختیار عبداللە بەرزنجی**

سروە شپێشوازی لە هاوکاری ئێوە دەکا. سپاست دەکەین.

سمنان **کاک ئەمین**

لە هەستی خاوێنت بەرانبەر بە گۆوارەکەتان سپاس دەکەین. ئێوە بۆ ئەوەی هاوکاریمان بکەن دەتوانن نێوەرۆکی گۆوارەکە هەڵسەنگێنن، لە هەر زەمینەیەکی ئەدەبی و فەرهەنگیدا کە لەگەڵزانست و زەوقی خۆتان دەگونجێ یارمەتیمان بدەن.

پیرانشار: **کاک قادری عەزیزی**

ئێمە چاوەڕوانی هەر چەشنە هاوکارییەکی ئێوەین. هەر چەند خۆت بە نووسەر نازانی، بەڵام کوردی نووسینەکەت زۆر جوان بوو. داوا دەکەین پەیوەندیمان لەگەڵ نەپسێنی، تا بەڵکوو ڕێگایەک بۆ هاوکاری زیاتر بدۆزینەوە.

وەزگێڵی سەردەشت: **کاک ئارمان کوردستانی**

کاکە گیان ئەگەر وەک هاوکاری باش دەتەوێ هاوکاریمان بکەی بەیت و باوی کۆنی کوردی لە مەڵبەندی ئێوە زۆرن، بۆمان بخەسەر شریت و بێ ئەوە خۆت زیاد و کەمیان بکەی بۆمان بنێرە.

بڕلەن ئاڵمان: **کاک ئارام**

سپاسی هەستی خاوێنت دەکەین. سروە لەخزمەت فەرهەنگ و ئەدەبی کورددایە و بۆ سەرکەوتنی زیاتر بە شانازییەوە لە هەرچەشنە هاوکارییەکی ماموستایان و ئەدەبدۆستان کەلک وەردەگرێ تکایە لە هاوکاری خۆتان بێ بەشمان مەکە.

ئیسکی بەغدای بۆکان: **کاک ڕەشیدی حەبیبی فەڕ**

ئێمە چۆن دڵی ئێوەی گوندنشین دەشکێنین.

ئێوەن کە جگە لەوەی بە ئارەقەی نێو چاوانتان بژیوی شارنشینان دابین دەکەن زمانەکەشمان دەپارێزن، خوا بتانپارێزێ

بۆکان: **کاک حامیدی ئەحمەدی**

براگیان ئێوە دەتوانن ڕەخنە لە نووسەران بگرن یا لەسەرهەر بابەتێک کە پێتان وایە جێگای ڕەخنەیە بە زمانی کوردی بۆمان بەڕێ بکەن.

مەریوان: **کاک نامیقی کوهنەپووشی**

نامە و وێنە جوانەکانتان گەیشت. چاوەڕوانی نووسراوەکانی دیکەی ئێوەین

* * *

نامەوشیعرونووسراوەی ئەم خۆشەویستانەشمان گەیشتۆتە دەست خوا یار بێ لە ژمارەکانی داهاتوودا دەیانخەینە بەر سەرنج ولێکۆڵینەوە لە نووسراوە بەنرخەکان کەلک وەردەگرین وەڵامی نامەو پرسیارەکان دەدەینەوە و ئەوەی پێویستی بە ڕێنموونی بێ ڕێنوێنی دەکەین دیارە ژمارەیەک لەم نامە و نووسراوانە زۆر لە مێژە ناردراون ونۆرەبڕییان لێ کراوە ئەویش تەنیا لەبەر ئەوەیەکە نێوەرۆکەکەمان لەگەڵ نێوەرۆکی ئەم ژمارەدا ڕێک نەدەکەوت، یا خۆ لە بەرتەواو بوونی گۆوارەکە جێگا بۆ نووسراوەی دیکە نەمابوو لەگەڵ داوای لێبووردن هیوادارین لێمان دڵمەند نەبن و گەرم و گوڕتر لە جاران پەیوەندی خۆیان و گۆوارەکە یان درێژە بدەن.

**مەهاباد**: کاک حوسێنی شێخ ئاغایی، کاک سەلاحی عەبباس تاهیری، خوشکە فەوزیەی ق. ، کاک قوربانعەلی کەریمی کاک دوکتۆر سەمەدی قابیلی کاک سەلاحی عەرەبی، کاک ئەحمەدی بەحری، کاک عومەری غەزالی، کاک کەریمی فەرشی کاک عومەری ڕەسووڵی، کاک کەماڵی ڕەشید پووری، کاک مستەفا ڕەسووڵی، کاک سمایلی بەختیاری، کاک ئازادی پیرۆتی کاک سەیدعبدالقادری سیادت

کاک ع.غ.ه مبار ،کاک سه یـد
محه ممه دی سه مه دی،کـاک
سه یدعبدالله سه مه ـه دی
کاک سیله مه ندی فتووحی ،کـاک
جه مال عبدالکریم

**بۆکان :**کاک ئه حمه دی تاها
کاک ئیسماعیلی ره حمانـی
کاک ئه حمه دی مه ولانی،کـاک
ئه حمه دی محه ممه دی (دلنیا)
کاک ئیسماعیلی قاسمی(هیوا)
کاک محمدسعیدی نه جاری -
(ئاسۆ)،کاک محه ممه دی سالحی
کاک سوله یمانی جهانگیری ،
کاک ئه حمه دی مه کاری،کـاک
ئ.م.ئارام،کاک عومه ری حیسامی

**سه قز :**خوشکه نه سرینـی
تورابی،خوشکه ئامینـه ی
عه زیزی،کاک عومه ری فارووقی ،
کاک عه زیزی که یخوسره وی،کاک
محی الدین خوسره وپـوور،کاک
خالیدی ئه مینی،کاک لوقمانی
مه تاعی،کاک محه ممه دی سه دیقی
کاک حوسین ،کاک حامید،کـاک
مسته فا حوسین پوور

**سنه :**کاک حه میدی کریمیان
کاک یدالله زارع زاده ،کـاک
فه ره یدوونی مه حموودی،کـاک
جه لالی مسته فایی،کـاک
مه نسووری ئه یلزی،کـاک
عابدینی کولاه زه ردی،کـاک
ش.ع

**تاران :**کاک ئۆرغان غالب
کاک کامه ران کوێستانی،کاک
ج.ئاشتی،کاک سمایلی قه زاق ،
کاک ئ.هه مه وه ند،.

**ته ورێز :**کاک قـادری
فه تتاحی قازی،کاک عبدالرحیمی
فه تتاحی قازی،کاک تـاهـا
فه یزی زاده ،کاک ب. غه ریب
کاک ئ. حه میدی .

**پیرانشار :**کاک مسته فـا
عه تتار،کاک عبداللـه
ئیسماعیلی،کاک قادر پـۆلا
کاک ئیسماعیلی سه یدشوکـری
کاک ره حیمی ئه حمه دی

**نه غه ده :**کاک سمایلـی
دووبرازاده ،کاک ح.راوچـی
کاک سه یدئه حمه دی حوسێنـی
کاک دژوار خالیدعـه زیـز .

**ورمێ :**کاک ئازادعیسـا
کاک یووسفی شنۆیی مه حمـوود
زاده ،کاک ئه حمه دده شتی .

**باختەران :**کاک ئه حمـه دی
شه ریفی،کاک یاسینی فه تتاحی

**بانه :**کاک ص.ئـاواره
کاک حاجی ره ئووفی سه لیمـی

**شنۆ :**کاک به هه منی ره شیدی
زه رزا،کاک عبدالله مدرس
کاک غه فووری سه لیمـی

**مه ریوان :**کـاک ح.ا .
جووتیار،کاک عومـه ری
کوردستانی وهاورێ یانـی ،

**ناوچه ی ئالانی سه رده شـت**
کاک عبدالله مینایی .

**گوندی قۆلنجی مه حالـی ئه نزه ل**
ماموستا مه لاعبدالقادری کوردی

**گوندی قه ره سه قه لی شنـۆ**
کاک محه ممه دی حوسێن پـوور

**گوندی قۆزلوێی چووکـی مهاباد**
کاک ره حمانی حاجی .

**گوندی درووی شنۆ :**کـاک
شه فیعی جهانگیری .

**گوندی ره حیمخانی بۆکان :**
کاک ئه حمه دی حاجی ئیسماعیل
زاده ، کاک نادری مسته فازاده .

**گوندی سۆغانلووی پیرانشار**
کاک عومه رو کاک ره حمانـی
نه بی پوور .

**گوندی کاژێی سه رده شـت**
کاک ع.شێواو ،کاک سه عیدی ،
ره حمانی ،

**سه ددی شه هیدی کاظمی:**کـاک
محه ممه دی حه بیبی .

**که ره ج :**کاک دوکتـۆر
سه فین،کاک عومه رقادر .

**ئه هواز :**کاک برایمی سه عیدی
کاک ئ .حه میدی .کاک خالیـد
ده یله مـی .

**خۆی :**کاک جه لالی قشووری

**سه لماس :**کاک ابوالقاسمـی
سادق ئه میری .

**که ره ندی غه رب :**کاک رێبوار
به رزه نجی .

**بروجرد :**کاک مه حمـوودی
ده بیرفه که ک .

**کرمان :**کاک ئه حمـه دی
شمس الهی .

**ساوه :**کاک مسته فا سۆفـی
عه لی ره واندووزی .

**سمنان :**کاک به ختیـار
عبدالله به رزه نجی .

**کوپنهاک :**کاک فه رهـاد
پیوبال .

**له نده ن :**کاک سه باحـی
غالب .

**ئامستردام :**کاک ح .بـێ
رێز .

*** ** **

# ڕێنوێنی

سەقز :**کاک ئیرەج هەژار ،**
کوردی نوسینەکەت زۆر ،
جوان وڕێک وپێکە ئەگەر
بتوانی بەکەلک وەرگرتن
لە ئوسوولی چیرۆک نووسی
لەوسووژە جوانەکە بەتەواوی
رئیالیستی یە ، کورتە
چیرۆکێک دەربێنی . نرخی
ئەدەبی زیاتر دەبێ .
چونکوو نووسراوەکەت وەک
گێڕانەوەی بیرەوەری یەکە نە
وەک کورتە چیرۆکێک .

ئیستیعدادێکی باشت
بۆشاعیری هەیە . شیعری
شاعیرە مەزنەکان پتر
بخوێنەوە . داهاتوویەکی
باشت بۆ چاوەڕوان دەکەین.
شیعرێکت لەسەر ئیعدامی
شاعیری شۆڕشگێڕی ئەفریقایی
بنجامین ملایزی بۆناردبووین
لەبەر هێندێک کەم وکووڕی
نەمانتوانی بڵاوی
بکەینەوە .

سەردەشت :**کاک برایم ب**
تێ بکۆشە سووژەی ،
شیعرت هەر ئی خۆت بێ .
ئەم شیعرت دەگەڵ ئەوەیدا
کە زۆر ڕێک و پێک نەبوو
شوێنی شیعری شاعیرێکی
کوردی زۆر پێوە دیاربوو .

مەریوان :**کاک ج. ا. ، جووتیار**
شیعرەکانت کەم هێزبوون
بەڵام پەخشان جوان دەنووسی
کە وابوو لە باتی شیعر لە
بە شێکی دیکەی ئەدەبیدا
کاربکە . سەردەکەوی .

بۆکان :**کاک عەلی**
دیارە زەوقی شیعرت هەیە
بە هیوای کۆششی زیاتری
ئێوەین . بەڵام موتاڵایەکی
زیاتریش بکە تا ڕەدیف
و قافیەت لێ تێک نەچێ

نەغەدە :**کاک ح. راوچی**
بەوهەستە پاکەیدا
دەرت بڕیوە وبە نووسینە
جوانەکە تدادیارە کە
دەتوانی هاوکارێکی باشی
سروە بی . بەڵام شیعرەکانت
زۆر بەهێزنین ، ئەدەبی
کوردیش ئێستاکە زیاتر لە
شیعر نیازی بە پەخشان
نووسی هەیە هیوادارین
زیاتر لەشیعر خۆ بە
نووسینەوە ماندوو بکەی.

مەهاباد :**کاک م.ع**
شیعرەکانت لەبارێ کێشەوە
کەم و کووڕیان هەبوو ،
زیاتر لە سەر شیعرموتاڵابکە

ناوچەی مامەشی لاجان:
**کاک ئەحمەد دڵدار**
لە پێشدا تکادەکەین
نازناوەکەت بگۆڕە چونکوو
شاعیری بەو نازناوە زۆرن
شیعرەکانت هێشتا لەو
پلەدانین کە چاپ بکرێن
پتر تێبکۆشە

مەریوان :**کاک ئەرسەلانی عەزیزی**
وێڕای سپاس وەک خۆت
نووسیووت کوردی نووسینەکەت
هێشتا کاڵ و کرچە . بەڵام
بە موتاڵای زیاتردەتوانی
ئەم کەم وکوڕیە نەهێڵی .
کورد کوتوویەتی کەس لە
پڕێکەوە نابێتە کوڕێک
داوای سەرکەوتنت بۆ
دەکەین .

مەهاباد : **کاک عەلی داهوان**
ئێوە نیازتان بەموتاڵای
زیاتری قەواعیدی شیعری
و دیوانی شاعیرە مەزنەکان
هەیە . بۆ ڕێنموونی زیاتر
لەم شیعرەتدا

ڕوگرژو زۆر وەڕەز بوو
لە گیانی خۆی بێزار بوو

وشەی "بوو" ڕەدیفە نەک
قافیە ."وەڕەز "و"بێزار"یش
قافیەنین

مەهاباد : **کاک مستەفا ڕەسوولی .**
بەهەڵبژاردنی سووژەی
جوان و بەودەست و قەڵەمە
پتر دەتوانن خزمەت بە
فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
بکەن و ئێمە یارمەتی بدەن

# لە ئەدەبدا

ئەندیمشک: عەزیزی ئازاد

هەروەک خۆت نووسیوتە شاعیر (ێکی بەئەزموون)نی و زەوقی نووسینت هەیە بەو پەخشانە جوانەی کەدەنووسی پێمان حەیفە خۆت بەشیعرەوە ماندووبکەی. هەر ئەو مەبەستەی بەشیعری، نووسیبووت ئەگەر پەخشان بووبایە زیاتر کەلکی لێ وەر دەگیرا.

بانە: خوشکە شەهین

ئاهەنگ و قافیەی شیعرەکانت خراپ نەبوو. بەڵام لەباری مەوزووعەوە زۆر تێکەڵ پێکەڵ بوو هیوادارین بەرهەمەکانی دیکە شتمان بۆ بنێری.

گوندی نەڵاسی سەردەشت: کاک هوشیار رشەبستانی

شیعرەکەت لەباری قەواعیدی شیعرییەوە زۆر کزە. بۆوێنە لەسێ دێڕی چوارەم بە دواقافیەکەت گۆڕیوە. کە ئەوە لەگەڵ شیعری عەرووزیدا جیاوازی هەیە هیوادارین پتر موتالابکەی. داوای سەرکەوتنت بۆ دەکەین.

بانە: کاک ت. نزار

هێشتا ناتوانی هەستی دەروونی خۆت لەکێشی عەرووزیدا باش بگونجێنی بە بڕوای ئێمە ئەگەر پتر تێبکۆشی و زیاترشیعری شاعیرە مەزنەکان بخوێنیەوە و لە کێشی خۆماڵیدا شیعر بڵێی دوا رۆژێکی روونت لە پێشدایە.

گوندی کۆنەخانی پیرانشار: کاک سەید ئیسماعیلی سەید شوکری و کاک عبدالرحمن ئەنبایی

لەم ژمارەدا جێگا بۆ چیرۆکی فۆلکلۆریک نەمابوو هیوادارین هەروا هاوکارمان بکەن. بەڵام تێ بکۆشن رەسەنی زمانی چیرۆکی فۆلکلۆری تێک مەدەن.

بێورانی سەردەشت: کاک هیوا بێورەیی

لە وشیعرەیدا کە ناردووتە گوڵزارو دڵ ودین قافیەنین کەم لێرەدا رەدیفە و قافیە نیە جارێ ئەوانە فێربە جا ئەو دەمێ شیعری عەرووزی، بڵێ.

سنە: کاک نصرالدینی شەریفزادە.

وادایارە ئەمە یەکەم کاری ئەدەبی ئێوەیە کەبۆت ناردووین ئاواتی دوارۆژێکی گەشەدارت بۆ دەخوازین.

چاوەڕوانی گەیشتنی وتارە مێژوویییەکانی ئێوەین.

گوندی باب خالاویی شنۆ: کاک مستەفا شێخە

شیعرەکەت لەباری قافیەوە زۆر جوان بوو و هەستێکی خاوێنیشت تێدا دەربڕیوە، بەڵام بەداخەوە کێشی تەواو نەبوو. بۆوێنە یەکەم دێڕی کەدەڵێ

"لەم چەرخەدا کە ئێستا لە خولی بیستەمدایە"
"لە سەردەمیکی ناسک وگەڵێ ئەستەمدایە"

مووسیقای شیعری تێدا نیە بە خوێندنەوەی زیاتری دیوانی شاعیرە مەزنەکان ئەم کەم و کووڕییەت نامێنێ.

کوردی نووسینەکەت زۆر لەبارە. هیوادارین درێژە بە هاوکاری بدەی.

سنە: م.د. هەردەوان

ئەوشیعرانەی لەسەر کێشی خۆماڵین جوانن بەڵام لە شیعری عەرووزیدا کەم هێزی و دەبێ پترمتالا، بکەی و خۆت ماندووبکەی

# تۆڵەی ئەژدەهاک

خ: ئەویندار

رۆژێکی زۆر تاڵ بوو، رۆژەڕەشی وا کەم کەس دیبووی. خەڵکی شار بە خڕی هاتبوونە دەرێ، یا خزا بوونە خڕ و جۆمان یا پەڕیوەی لادێ ببوون و روویان دەهەندەران کردبوو. هێندێکیان خێوەتیان هەڵدابوو، بڕێکیش کەپریان دروست کردبوو تا منداڵەکانیان لە بڵێسەی هەتاوی جۆزەردان بشارنەوە بەڵام زوربەیان روویان دە بەروموووچەی خۆ یا ئی خزمەکانیان کردبوو، خۆیان لە نێو جۆگە و کەندالان حەشار دابوو. بە دڵی شکاو بە چاوی پڕ لە فرمێسک دەیانڕوانییە دیمەنی شارەکەیان کە دەتگوت هەتیوێکی بێنازە و لە کۆشی دایکیدا خرپ خەوی لێکەوتووە هەموو بیریان لە وێرانی شارەکەیان دەکردەوە. دوژمن هەڕەشەی خاپوورکردنی لێ کردبوو.

لە نێو ئەوکەسانەیدا پەنایان بۆ باخەکەی مامجوامێر هێنابوو، "شوانە" لە هەموویان پتر هەراسان بوو. شوانە لاوێکی کەڵەگەتی سوور و سپی بوو، خوێندنی مەدرەسەی تەواو کردبوو، لە کۆنکووری زانستگاە سەرکەوتبوو، کەچی لەبەر هەژاری و دەستەنگی نەیتوانیبوو درێژە بە خوێندن بدا. زۆر هونەردۆست بوو، هەمیشە دیوانی شاعیرێک یا رۆمانێکی بە دەستەوە بوو کەمتر قسەی دەکرد، ئەگەر وەقسەش هاتبا هەر شیرین بوو گوێی بۆ رابدێری. کوڕێکی زار بە پێکەنین بوو، لەگەڵ زوربەی ئاواڵەکانی یەکماڵ بوو، کەسیش قسەی سووکی لێ نەدەبیست، بۆ پەیداکردنی پارووە نانێک شەو و رۆژ ئارەقەی دەڕشت، کەرتکە خێزانێکی بە ئەستۆوە بوو، ئەوەندەی رەنج دەکێشا قەت نەیدەهێشت خوشکە هەتیوەکانی زەردەیان لە لێو بتۆرێ. زۆرباش دڵی دایکی راگرتبوو، نەیدەهێشت دڵی گەردی لێ بنیشێ، بۆیە ئەوانیش زۆریان

خۆش دەویست .

ئەوێ ڕۆژی کە خەڵک ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێهێشتبوو، ئۆقرەی نەدەگرت . هەڵدەستا چەند هەنگاو وێوە دەچوو و چەند هەنگاو واوە دەهاتەوە، هێندیک رادەما ، سیغارێکی دادەگیرساند ،یەک دوو مژی لێ دەدا ، هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا ، زەق دەگۆشەیەکی ئەو گۆڕستانە بەربڵاوەی هەڵدەورانی کە لەوبەری شار بەرقەدی شاخەوە راکشابوو ، ئاڵای سووری لەسەر چەقا بوون و با دەیشەکاندنەوە . مووی لێ نەدەبزووت . چاوی نەدەترووکاند لەپڕ زیقەی منداڵێک ، شریخەی تفەنگێک ، گرمەی تۆپێک رایدەچڵەکاند ، هەودای خەیاڵی دەپساند ، بە پەشێوی ئاخێکی هەڵدەکێشا و دەستی بە قەدم لێدان دەکردەوە . ئەوەندە هات و چوو ، ماندوو بوو ، ئەژنۆی دەلەرزی، شل و شەکەت ببوو ، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد وەک بیەوێ بەتاقی کاتەوە ، نێو چاوانی گرژ کرد ،لێوەکانی وەلەرزین کەوتن ، هەر کە مژۆڵەکانی لەسەریەک دادەنا تکە فرمێسکێک کە وەک ئەڵماس لەبەر تیشکی خۆر دەتروسکاوە لە سووچی چاویرا دەخزییە خوارێ و بەسەر کوڵمەیدا شۆڕ دەبۆوە و لەسەر سمێڵی دەگیرساوە،کەس نەیدەزانی بیر لە چی دەکاتەوە،بۆ وا پەرۆشە و لەبەرچیوا شەمزاوە؟ کەسیش بۆی هەڵنەدەهات کە چ ئاگرێکی لە دەروونــدا دەگرێ و کوورەی دڵی وا نێڵ داوە خەریکە هەموو گیان و لەشی دەسووتێنی،سەرنجی هەموویانی راکێشابوو . بەڵام دایکی هەر لێی خافڵ نەدەبوو. دەیزانی هەر کاتێکی ئازار هێرشی بۆ دێنێ و هورووژمی خەم و کەسەری دێتە سەر، ئاگای لە خۆی دەبڕێ،زۆر جار لە حاڵی ئاوادا چەند هەنگاوێکی زیاتر نەماوە بکەوێتە باوەشی مەرگ ، گوللەیەکی وەسەر دڵی بکەوێ یا لە نێو چۆم و گۆمدا بخنکێ . بۆیە لە وەختی وادا زۆر چاودێری لێ دەکرد .

شوانە کەمێک وەخۆهاتبۆوە ، سیغارێکی تری داگیرساند ، ئارەقەی نێو چاوانی سڕییەوە و لەبەر خۆیەوە ورتەیەکی لێهات ، پاش هێندێک بێدەنگی کە بۆی مات ببوو ،وەک مار پێیەوە بدا ، داچڵەکی و بە پەشۆکاوی و توورەییەوە گوتی :

ـ ئاخ ..ئەی چارەنووسی رەش ،حەیف ... دە سەد بریا منیش... منیش هەر ئەوێ ڕۆژێ ...دایکی بە دوودڵییەوە قسەکەی بڕی و گوتی :

ـ شوانە ، ڕۆڵە! ئەوە دەگەڵ کێتە؟ دەڵێی چی ؟! بۆ وا نارەحەتی دایک بەبرت مرێ ؟ لە کێ قەڵسی... دەسەرت گەڕێم !!!

شوانە کە تا ئێستا وا نوقمی خەیاڵاتی خۆی بوو ، پێی وانەبوو کەسی لێوە دیارە بە سەرسوڕماوییەوە گوتی :

ـ ئای دایە گیان ئەوە بۆ لەسەر سەرم راوەستاوی ؟ خۆ ئەمن چم نەگوتووە ، لە کەسیش قەڵس نیم ،لێم گەڕێ لێ !! با ئاوری دەروونم بە ڕێژنەی فرمێسک و خوزگەکانم دامرکێنم ،چت لە من داوە ؟ بچۆ لەگەڵ منداڵەکان خۆ وەشێرە لە من گەڕێ، دوایە دێمەوە لاتان،دەبڕۆ دایە گیان با مەرگی ئێوەش بە چاوی خۆم نەبینم .

کۆڵە و گری لە ئەوکی مابوو، کوڵ وا گەرووی ڕێک دەکوشی خەریک لوو بیخنکێنێ هەر کە باسی مەرگی کرد چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک و بە لووزە و فرمێسکیان لێ داوەری .

خۆی پێ نەگیرا و دایە پڕمەی گریان،زۆر بە تاو دەگریا ،دایکی بە خۆی نەوەستا خۆی بەسەر کێشا و لە ئامێزی گرت : دەمی بە دەمی یەوە ناو هەڵیمشت ،ئەوجار بەدەم گریانەوە بە سۆزی پڕ لە خۆشەویستی دایکانەوە گوتی:

ـ دەک ڕەببی کوێرابیم دایە ، لێرەدا • دەستی بە گابۆر و لە خۆدان کرد، ئەوە چت لێقەوماوە ، دەپێم بڵێ

بۆ دەگری، نیگەرانی ئێمەی؟!
ئۆ رەببی رۆڵە شیری ئەو
مەمکانەت لێ حەلاڵ بێ،
ئەوەندەی ئەمن لێت رازیم
خودا سەد ئەوەندەت لێ رازی
بێ، دەتو خوا پێم بڵێ بۆ
وا ئاڵۆزی لە ئامێزی گرت
و بە خۆیەوە کوشی.

شوانە تەواو بزرکا بوو، قسەی بۆ نەدەهات،بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا هەستی کرد لە نێو ئەم ئامێزەدا تەنگەتاوە لەسەرەخۆ وەدەنگ هات، بە ئاستەم نووزەی دەهات:

– دایە بەرم دە ...

دایک کە گوێی لە نووزەی کوڕەکەی بوو،لە خۆڕا گریی مەچەکی کراوە، هەستی کرد قورسایی‌یەک لەسەر سینگی لا دەچێ،سەری شۆڕ بۆوە،نێو چاوانی کوڕەکەی ماچ کرد، فرمێسکەکانی پڕژایە سەر دەم و چاوی شوانەی لاواز و رەنگ زەرد، هەوڵی دا بزەیەک بێنێتە سەر لێوان،جا پرسی:

– حەسایەوە رۆڵە؟ .... ئامێزی دایکی خۆت پێ ناخۆش بوو؟!

شوانە سەری هەڵێنا دی خوشکەکانی بە پەرۆشەوە دەوریان داوە، ئەویش هەر خەمبار بوو، لێیان وەدەنگ هات:

– چ قەوماوە.... ئەوە دەگرین؟ چ رووی داوە؟ ئەو کۆڕەتان بۆ لە دەوری من بەستووە؟!

هەموو دامرکان نەشمیل نەبێ.نەشمیل لە هەموان بچووکتر بوو،کچێکی رەزاسووک و خوێن شیرین بوو، هەموو خۆشیان دەویست، ئەویش پەشۆکا بوو.

شوانە دەستی درێژ کرد، جمگەی دەستی نەشمیلی گرت کێشایە لای خۆی، ئەم لا و ئەو لای روومەتی ماچ کرد، دەستێکی بەسەریدا هێنا، بە پێکەنینەوە گوتی:

– ئای لە کاکت نەکەوێ، ئەوە بۆ پەشۆکاوی، خۆ من ساغ و سەلیمم. بێ بەلا بی دایە، قەت نایەڵێ ئەم کچۆڵە بەستەزمانانە بە خەمی کۆنەوە سەر بنێنەوە.

ئەم چەند قسانەی شوانە هەواکەی وا گۆڕی هەموو هەستیان کرد تەواو سووک بوون و کوڵ و کۆیان دامرکاوە دەتگوت لە ناکاو رێژنەیەکی خێر و خۆشی‌یان بەسەردا باریوە.زوربەی خەڵک ئاگایان لەو کارەساتە بوو، بەڵام پەکیان پێ نەکەوت.

لەو نێوەدا تەنیا مام – جوامێر بوو خۆی پێ نەگیرا و هاتە سەر ئەوە بێتە لایان و بزانێ چی‌یان لێ قەوماوە، چونکە ئەو شوانەی زۆر چاک دەناسی و دەیزانی شوانە نایەڵێ ناکۆکی لە نێو خیزانەکەیاندا پێک بێ و لێشی روون بوو شوانە لەو کوڕانە نیە خۆ بەزل بگرێ و بە ئازاردانی خوشکەکانی،خۆ بنوێنێ یا لەگەڵ دایکی دەمە چەقە ساز بکا، بۆیە هێندێک سڵ بوو، بەراوەکەی راگوێست و لەبەر خۆیەوە گوتی:

" دەبێ چیان لێ قەومابێ، هەر ناکۆکی‌یەکیان هەبێ چاری دەکەین، خۆ من بەڵێنم بە کاک پیرۆتی رەحمەتیش داوە تا بتوانم نەیەڵم بەردی سارد و گەرمیان بێتە رێ!

مام جوامێر پیاوێکی رەقەڵەی دەستە باڵا بوو، لەبەر لاوازی و بێ گۆشتی توێڵی هەموو گنج و لۆچ بوو،

پاشماوەی ئەوادەبێ ...

لەبەرە خۆمەوە هەزار جۆرە فکر و خەیاڵم دەکرد، تاوێک دەمگوت کاک کەماڵ دوژمنمە و جارێک ئاشپەزم بە تاوانبار دەزانی، بەڵام راستیەکەی ئەمە بوو کە برینجەکە دەسووتا و دیار بوو یەکێک ئاورێ خۆش دەکا .

هەتا رۆژێک، تەمەشام کرد کار کاری ئینسان نیە ، شیرنکی قاپ و کەوچک شوتن بەسەر دوگمەی وەجاخ گازەکە دادێ و هەرچەند جاری کەماڵ شیلانکەکە رادەکێشێ ئاوری گازەکە خۆش دەبێ و بنکر دەبێ بە خەڵووز .

ئەوجار ئیدی حەسامەوە ، پالم داوە! خەمم لە دڵی برا، ئەوجار هەرچی مشتەری بوو یا گۆشتی چیری خواردووە یا برینجی بۆکز، مانگێکی رەبەقە پوولی ئاشپەز و کرێکارم دەرنەهێناوەتەوە . جا نازانم لەگەڵ کرێی ئیجارەی سەری مانگێ چ بکەم .

لە قەدیمەوە کوتوویانە بەرە لە لای تەنکیەوە دەدرێ !!!

---

سۆمایی چاوی لە کزی دابوو لە پارەکەوە کە کورە نێونجیەکەی شەهید ببوو ، پیری تەواو رووی تێکردبوو و کەنەفت و کەلەلای کردبوو خەم و پەژارە گەمارۆیان دابوو لەبەر گرانی جەرگ سووتان شانی خزیبوو ، و پشتی چەما بۆوە، هەر ئەو کەڵە مێر بوو دەنا کێیە سی رۆڵەی خۆشەویستی بە دەستی خۆی بنێتە گۆڕی تەنگ و تاریک و سارد و هێشتاش زیندوو بێ و دڵی نەتۆقیبێ؟! تەمەنی هێشتا لە شێستی هەڵنەبواردبوو، کەچی بە دیمەن زۆر پیرتر دیار بوو، هەر ئەو موسیبەتە وای لێ کردبوو دڵ ناسک بێ، زوو برەنجێ، بەم حاڵەشەوە قەت لە چاوەدێری و هاودەردی دەر و جیرانان خافڵ نەبوو. ئەوەندەی لە دەستی هاتبا پیاوەتی دەگەڵ دەکردن. پیرە پیاوێکی قسەخۆش و بە ئەزموون بوو . زۆری کوێرەوەری دیبوو، مزەی تاڵ و سوێری چێشتبوو .

ئەوێ رۆژێ نۆرەئاوی بوو گەنمی دەداشت، چۆغەیەکی شینکی شڕ، دەبەردا بوو ، کیسەی تووتن و پەڕەکەی دەبەر پشتی راکردبوو و دارجگەرەکەی لە پشتەستۆی چەقاندبوو. زۆر ماندوو و شەکەت بوو، ئارەقەی نێو چاوانی بە نێوان برۆیانیدا لووزەوی بەستبوو و بەسەر لووتیدا هەڵدەڕژا .دەلینگی تا پشت ئەژنۆیان هەڵکردبوو، پێمەرەیەکی ئەسپەرەداری لەسەر شان بوو، لە نێو گەنمەکەدا دەخولاوە ،بە وردی دەیڕوانی کوێ تەنک بوایە لاقی تا ئەژنۆکەیتری هەڵدێناوە و بە ئەسپایی هەنگاوی داوێشتێ،جار جارەش پێمەڕەکەی دێنا خوارێ و هێندێکی دە زەوی دەوەژاند، خەریکی هەڵگێرانەوەی پەڵان بوو ، ئێوارەی پێشتر شەواوی لێنابوو و بۆ سۆزی وردە پەڵەی هەڵدەگرتنەوە .

بەراوەکانی ئەوەندە بە ئارامی رادەگوێست کەمتر وابوو کە بەدەم پێمەڕەکەیەوە پنجە گەنمێک هەڵقەنێ ، ئەگەر چڵێک لار دەبۆوە ، هێدی هێدی دادەهاتەوە و چڵە گەنمەکەی راست دەکردەوە و تۆپە قوڕێکی بەسەر ریشەکانی دادەدا تا ئیشک نەبێ و لەنێو نەچێ ، بە ئاودێریکی چاک و پوخت ناوی دەرکردبوو. پیاوێکی خاوەن زەوق بوو، عاتیفەیەکی ئێگجار پاک و خاوێن و ئینسانی هەبوو، کە بیری لە هەژاری و کۆست کەوتەیی خۆی دەکردەوە،حەیرانی دەگوت یا بە گۆرانیەکی زۆر خەماوی سۆزی دەروونی دەردەبڕی و کوڵی دڵی دادەمرکاند، یا یادی کچە جوانەمەرگەکەی (بێری) دەکردەوە یا بە دوو شۆڕە لاوە شەهیدەکەیتری هەڵدەگوت .

( درێژەی هەیە )

# لەگەڵ شیعری شاعیرانی لاو

ئەستێرەکەم :
چاوی جوانت کە دادەگری
من پێم وایە بۆمن دەژی ، بۆ من دەمری
بەڵام گیانە ،
تۆ هەر بەشەو میوانمی
کە خۆر هەڵات دیسان ونی
ئەی ئاسکۆڵە
زۆر دەترسم
لەودێوەزمەی
لە ئاست ئەوینی من و تۆ........
لەسمکۆڵە ! ! ....
لەسمکۆڵە !!

" سالح شیروان"

" رق و فرمێسک "

چۆن بتوانم !
هەرگیز نابێ......
من دەریا نیم تووڕە ببم
من بەفری زستانی شووم نیم
نەتوێمەوە و رق هەڵگرم
من زنجیرێکی گیرۆدە نیم
بۆ زۆرداران کڕنۆش بەرم
من زریان نیم
تا بتوانم هەموو دنیا
بکەم
بەدوای خۆمدا ڕاپێچ
من ئەو کەسەم لە فرمێسکی چاوەکانتا تواومەوە

شەماڵ جودایی

"بۆگۆواری سروە"

شنەی شەماڵ هـەواڵی هێنـــا
بە وێنەی لەولاو خۆی هەڵ ئەهێنـا
لەم دێبۆ ئەودێ لەمشاربۆئەوشـار
لەم گوڵ بۆئەوگوڵ لەمدا ربۆئەودار
بولبول مەلیچک بێچوولەی بالـدار
لەبان تۆپی گوڵ لە سەرلوتکەی دار
ئەیان جریکان بە هەرزو بانـێ
لەهەر شەقامێکووچی و کوڵانـێ
دەیان گوت کوردە زستان بەهـارە
بەهاری ئەمساڵ خۆشتر لە پـارە
یاخوا هەربژی سروە لە ژینـــە
دەواو مەرهەمی دڵی برینـــە
دوعای خێر ئەکەم بە ڕۆژو بەشەو
لە بەر مانگە شەویان تاریکی شەو
ئەڵێم یاخوا سروە هەربژی بۆمان
دووربی لە تاڵی سەرکەوی لەژیان
"ژاکاو" ژاکیاگە ژیانی تاڵـە
سروە بخوێنە خەمت مەحاڵـە

( ژاکاو )

ع.م. بەرزنجی

ئەز پەپوولەی بێستـــانم
خولقاوی کوردستـــانم
پەپوولەی ناوی بـــاخم
شەیدای گوڵی سەر شاخم
دەفڕم لەم گوڵ بۆئەو گوڵ
تێر دەگەڕێم پڕ بە دڵ
کام گوڵەی زۆر زۆر جوانە
پەسندی دڵ و گیـــانە
دەیکەم بەها وڕێی گیانی
دەژین بە کامەرانـــی
من بۆ ئەو و ئەو بۆ مـن
دوور لە زۆردار و دوژمـن

ئاودێری دە دێمەکاران! شێخ جافر بابی
فەقیر و هەژاران،
شێخ جافر سێ میوانی دەهاتن لەوان میوانی
دەخاسە.
ڕۆڵە مەندە مەندەی دە دوڕناسە،
ئەوان میوانانە بۆ بابی خۆت بناسە.
بابەیەکیان خاڵندە یەکیان خدرە ئەوی دی
ئەلیاسە.
ڕۆڵە مەندە مەندە گیانە!
سەتی بۆریە و بەستەزمانە،
پاکی مردوون لە برسانە،
لەو مەندەی دەنوورانی یە! نەیدەکردەوە
بێ عەمری بابی یە،
دەستی دەداوە داس و گوریسی،
هەر چوار قوڕنەی دنیایەی بە بۆریان
دەپشکنی یە،
چەندی گیای هەوەڵ بۆهاری یە، هەمووی
دەسحێب دەزاری یە،
دەکاتەوە زکری خالەقی جەبباری یە،
جێگای پەت و سینگان خاڵی نیە،
بۆریەی دەهێنانەوە بە برسیایەتی یە،
خۆ بەڵان دەیگوت: بابە! بەوەی کەم کە
ڕەببی یە،
کە لە ژووری سەری یە،
ئەمن چوار قوڕنەی دنیایەم بە بۆریان
دەپشکنی یە،
چەندی گیای هەوەڵ بۆهاری یە، هەمووی
دەسحێب دەزاری یە،
دەکاتەوە زکری خالەقی جەبباری یە،
جێگای پەت و سینگان خاڵی نیە،
بۆریەم دەهێنانەوە بە برسیایەتی یە،
ئەوە شێخ جافر دەیگوت: ڕۆڵە مەندە!
مەندە گیانە! سەتی بۆریەو بەستەزمانە،
پاکی مردوون لە برسانە،
لەو مەندەی دەنوورانی یە، دوبارە
نەیدەکردەوە بێ حەمری بابی یە،
چوار قوڕنەی دنیایەی دەپشکنی یە،
چەندی گیای هەوەڵ بۆهاری یە، هەمووی
دەسحێب دەزاری یە،
دەکاتەوە زکری خالەقی جەبباری یە،
جێگای پەت و سینگان خاڵی نیە،
بۆریەی دەهێناوە بە برسیایەتی یە،
دەیگوت: بابە! بەوەی کەم کە ڕەببی یە
کە لە ژووری سەری یە،
دوبارە چوار قوڕنەی دنیایەم دەپشکنی یە
چەندی گیای هەوەڵ بۆهاری یە،
هەمووی دەسحێب دەزاری یە،
دەکاتەوە زکری خالەقی جەبباری یە،
جێگای پەت و سینگان خاڵی نیە،
بۆریەم دەهێناوە بە برسیایەتی یە،
ئەوە شێخ جافر دەیگوت:

رۆڵە تۆکانی ، ئەمن جۆمە :
تۆ دانیشە و من دەڕۆمە ،
ئەوە شێخ مەند دەیگوت بابە !
هەر لە زەمانی دەپێشینان تا زەمانی
دەپاشینان نەمدەدی باب لەبەر
کوڕیان بڕۆن ، هەر کوڕ لەبەر بابیان
ڕۆیون ، ئەتۆکانی ئەمن جۆمە :
تۆ دانیشە و من دەڕۆمە ،
ئەوە شێخ جافر دەیگوت :
رۆڵە مەندە من حومرم دەگەیی بە —
شێست وسێ ساڵی یە ،
نەمدەدی دوومێگەلە کاوڕی قورس لە نوالێکی
دوو شێخی بە قەوەت لەسەر بەرماڵێکی
ئەتۆکانی ئەمن جۆمە : تۆ دانیشە من
دەڕۆمە ،
ئەوە شێخ مەند دەیگوت :
بابە حومرم گەیوە بە چاردەی ،پێی ناوە
دە پازدەی ،
نەمدەدی دوو شێری بە قەوەت لە لانێکی
دوو پادشای زۆردار لەسەر تەختێکی
ئەتۆکانی ئەمن جۆمە : تۆ دانیشە من دەڕۆمە
ئەوە شێخ مەند دەستی دەداوە کەشکۆڵێک
و دار عەسایی یە ،
دەکەوتە بەرماڵان ، شێخ جافر پەشیمان
دەبۆوە ، دەیگوت :
دایکی مەندیم بۆ بانگکەن وێڕای کوێتان
بەرێی کەن ، مەندم زیز بووە ئاشتی
وەکەن ،
دایکی مەندی دەهات دەیگوت :
رۆڵە مەندە ! مەندەی دەڕواڵە !
شیری ئەو مەمکانەت لێ دەکەمەوە حەڵاڵە
بە قسەی دایکت بگەڕێوە بەرەو ماڵە ،
ئەوە شێخ مەند دەیگوت :
دایە ! بەوەی کەم کە رەببی یە ، کە لە
ژووری سەری یە ،
ئەگەر لێم دەگەڕێی چاکە ، ئەگەر لێم
ناگەڕێی ،

لە دیوانی خودا و پێغەمبەران سوڕی تۆ
دەکەمەوە ئاشکرایی یە ،
ئەوە دایکی دەیگوت :
رۆڵە ! ئەگەر سوڕی من نەکەیەوە ئاشکرایی یە ،
رەبی بۆت نازڵ بێ شێخ رەش و شێخ هادی یە ،
بە خوێنی سەرت ببنەوە توونی یە ،
بە جوانی خۆت نەبیەوە شادی یە
ئەوە شێخ مەند دەیگوت :
دایە ئەتۆ کیژ بووی لە نێو کیژانە ،
بابم کوڕ بوو لە نێو کوڕانە ،
ئەوە ژوانوو دەکردەوە لە کانیلەی
دەبەر ماڵانە ،
یەکی سێوێکی سوور و دەداوە بە یەکتر
بە نیشانە ،
ئەمن حەوت ساڵ بوو روحم لەسەر ئەنگۆی
دەکردەوە سەیرانە .
خۆ ئەوە دایکی دەیگوت :
رۆڵە ! وەکوو سوڕی منت کردەوە ئاشکرایی یە ،
رەبی بۆت نازڵ بێ شیخ رەش و شێخ هادی یە ،
بە خوێنی سەرت ببنەوە توونی یە ،
بە جوانی خۆت نەبیەوە شادی یە ،
ئەوە شێخ مەندە دەستی دەدا کەشکۆڵێک و
دار عەسایی یە ،
پشتی دەکردەوە ئاوەدانی یە ،
رووی دەکردەوە دەچۆڵی یە ،
بەڵان دەڕۆیەوە بۆ لای شاری یە ،
شێخ رەش و شێخ هادی بژاری پەمۆیان دەکرد
ئەگەر نەزەری دەکردە بژاری، بژار سەری
وشک دەبوو ،
پەمۆ زەنگوڵ زەنگوڵ عارەقی دەرشتی یە ،
شێخ هادی دە، شێخ رەشی دەکوتا دەیگوت :
کاکە ئەوە شێخ مەندی ئامۆزامانە دەچێتەوە
نێو شاری یە ،
ئەوی دەکەن بە گەورە، ئەمە دەکەن بە
چووکایەتی وی یە ،
نوێژ کەرە ، نوێژی ناچێ ،
خۆی لی بکەوە بە مارێکی رەشی لغاوە سپی یە

لێی بچۆوە دەپەڕەی تاتی‌یە ،
بەبەری پێیەوە دەوە تا تووکی سەری
بە با دەیی‌یە .
خۆ ئەوە شێخ ڕەش دەبوو بە مارێکی ڕەشی
لغاوە سپی‌یە ،
لێی دەچۆوە دەپەڕی دەتاتی‌یە .
شێخ مەند دەچۆوە سەر بەردی بەردە تاتی‌یە،
دەیگوت : ئەریٚ بەردی بەردە تاتی‌یە !
تۆ ناترسی لە ڕۆژی قیامەتیٚ کە
بتسووتێننەوە بە ئاگری‌یە ؟
ئەو مارە ڕەشە لغاوە سپیٚ چیە وەخۆت
دەگرتی‌یە ؟
خۆ ئەوە بەردی دە بەردە تاتی ڕێکی دەکوشی
شێخ ڕەش دەردەپەڕی، دەبۆوە بە بەرانێکی
شین بەشی کەلێنی‌یە ،
شێخ مەند دەبۆوە بە بەرانێکی . زەربەشی
کەلێنی‌یە ،
تا ئێواریٚ لێکیان دەدا هیچیان زەفەریان
بە هیچیان نەدەبردی‌یە ،
ئێواریٚ سوێندی بۆ دەخوارد بە سوێندی
پیاوانە ،
تەلاقی بۆ دەخوارد بە تەلاقی ژنانە :
ئەتۆ بە ڕوحانەت بچۆوە بەحەشتیٚ ،
قەندیلەم بۆ بێنە ئەمن بە قالبی تۆ
ناکەمەوە غەیانە ،
ئەوە شێخ مەند بە ڕوحانەت دەچۆ بەحەشتیٚ
ئەگەر قەندیلەی بۆ شێخ ڕەشی بێنیٚ ،
شێخ ڕەشم زۆر بە فێڵە خەنجەری دمە بێڵە
سێی لێدەدان بە فێڵە .
وەی هاوار، هاوار، هاوار، قالبم بۆوە
بریندار !
کاغەزێکی نووسی‌یە ،
هاواری کردە زریانی‌یە ،
وەی زریانە هەوێکە !
ئەو کاغەزەی بەرێکە ،
دایک و بابم حالی کە ،
زریان دەیگوت : وەی شاسوارەی جوندی‌یە !
پیر بووم تاقەتم نیە ،
هاوار کە شەمالی‌یە ،
شەمالٚ دەهات کاغەزی دەڕفاند ،
دایکی مەندیم لەبەر نانی‌یە ،
دەستی دا بەو ڕانی‌یە ،
شێخ مەندم دۆڕاندی‌یە ،
حەک مووم بیٚ لە زبانی‌یە ،
دە هاواری مەندیم بیٚ،شێخ برایمی خالی بیٚ ،
دە هاواری مەندیم بیٚ،شەمسی والە تەورێزیٚ
دە هاواری مەندیم بیٚ ، شێخ هەمزەی
ئامۆزای بیٚ ،
دە هاواری مەندیم بیٚ ، چاکی لە دولٚ
پەممۆیە ،
دە هاواری مەندیم بیٚ سەیدی دەماوەلۆیە،
دە هاواری مەندیم بیٚ شەخسی لەبەرە جۆیە
قوولە و هەلٚلا پەیدا بوو ،
کۆڕەی زکری گیرابوو ،
شێخ برایمی خالی دەیگوت :
وەگەرمبیٚ هەلٚوێژم دونیای پاک تێک
داوێژم، خوێنی مەندی دەڕێژن ؟
قوولە و هەلٚلا پەیدا بوو ، شێخ هەمزەی
ئامۆزای گوتی :
وەگەرمبیٚ هەلٚبێنم دونیای پاک تێک
داوێنم ،
تۆلەی مەندی دەستێنم ،
شێخ ڕەش لە ترسان دەچۆوە پشت ڕۆژیٚ .
ئەوان شێخان ئەوان مشایخان دەیانگوت:
شێخ ڕەش عاشقی چیە ؟
دەیانگوت :
شێخ ڕەش عاشقی زکری‌یە ،
ئەوان شێخان ئەوان مشایخان کۆڕی
زکریان دەبەست و
شێخ ڕەش لە پشت‌ڕۆژیٚ سەری وەدەردەنا ،
ئەگەر نەزەریان دەکردەوە شێخ ڕەشی‌یە ،
شێخ ڕەشیش دەسووتا بەردەبۆوە، بە تیری
شێخ مەندی گرفتار دەبۆوە .

* * * * *

# پەندی پێشینیان

## مەتەڵ

هاتە خوار بە خشەخش مامە گەورەی ڕدێن فش .

بەرازی نابەراز چل گەزی کەراس.

لووت چرچی چل کون .

زەوی گۆشتە ، تۆوی بەردە گاسنی شاخە .

سووری هەراش ، سەگی نێو بەرداش .

بای بدەی بازرگان دەکا ، هێلکەی وەک چرگان دەکا .

ڕەشی کون کون ، ئافەریم بزن .

سەری قوڕینە ،بنی دارینە ، خواردنی گیای شینە .

سێ بێ ، سێ زەردەبێ ، سێ هەنار ، سێ ژەهری مار .

تەپکە خریلەی گیا وردیلە .

هەڵدەستێ وەک فیتەری کلکی لە تۆقی سەری .

دایک لە دەشتێ ، کوڕ لە پشتێ .

لێرەدا پڕ بەدڵ سپاسی کاک ئەحمەدی بەحری کاک سەید محەممەد سادقی حوسێنی ، کاک ئازاد عسیا ، کاک خدری بەهرام بەگی ،سەید ئیسماعیلی سەید شوکری ،کاک سەعیدی محەممەدزادە .دەکەین کە بۆ ڕازاندنەوەی ئەم بەشە یارمەتییان داوین . هیواداریـن پەیوەندی خۆیان پتر درێژە پێ بدەن .خوا ئاگاداریان بێ .

هەموو شتێک بە خوێ، خوێش بە مەعنا .

کای خۆت نیە ، کادێنی خۆتە .

داعبای گۆشت خۆر دندووکی خوارە .

موویەک لە بەرازی بێتەوە زۆرە .

بە وشتریان گوت : کوڕت بوو: گوتی: ئەو بارەی لە خۆمە هەر لە خۆمە .

قەزای دیزەی وە گۆزەی کەوت.

بەڕە لە لای تەنکێوە دەدڕێ .

گاڕانیان بە گردەوە دەبرد لە مانگا بەڵەکیان دەپرسی !

ئەگەر د تیانم ئەزم ،نەیاندیتم دزم

پووریێ دەچێ بۆ مردن،مووروو دەکا لە گەردن !

لە ئێستریان پرسی بابت کێیە؟ گوتی خاڵم ئەسپە .

میوان میوانی خۆش نەدەویست،خانە. خوێ هەردوو .

پیواز بێ و بەقات و نیاز بێ !

خزم گۆشتت بخوا ئێسکت ناشکێنێ .

لە سوار چاکێی نیە ئەسپەکەی هەڵی گرتووە .

بەرخێ نێر هەر بۆ کێرێیە .

پا لە قەلسە هێجەت داسە .

تێ سۆتن نایێ گۆتن .

تێژکێت شێرا شێرن .

چاڤێ کێر نەیێ تلیا خۆ لْ بن بدە ودەرینە .

خودێ گۆشت ددت مروڤێ بێ ددان .

خوین نابت ئاف .

دەرمانێ هەر تشتێ زێڕە ،بەلێ ژ زێر خورتتر زۆرە .

دنیا هەمی نەیاری کەوییە ،کەوژی نەیاریخۆیە.

شێر شێرە چ ژنە و چ مێرە .

کابرایەکی فەقیر لەماڵی دەوڵەمەندێک وەژوور دەکەوێ و دەڵێ :

– برالە من وتۆ هەردووک ڕۆڵەی ئادەم و حەووا ین کە وابوو براین . جا ئەگەر براش بین هاتووم بەشە ماڵی خۆم بەرم

کابرای دەوڵەمەند دەست لە گیرفانی ڕۆدەکا وقرانێکی دەداتی .

فەقیرەکە دەڵێ :

– برالە لەم هەموو سامان وماڵە هەر ئەوەندەم وەبەر دەکەوێ ؟

– بێدەنگ بە ! ڕاست سەری خۆت داخەو برۆ . دەنا ئەگەر براکانی دیکەمان پێ بزانن ئەوەندەشت وەبەر ناکەوێ .

# قسەی خۆش

پادشایەک بەوەزیرەکەی دەڵێ :

– هەستە هەرچی سواڵکەر هەیە لەم شارەدا ناویان بنووسە !.

وەزیر دەڕوا پاش دووسێ ڕۆژان دەگەڕێتەوە ولیستەی سواڵکەران بۆ پادشا دەبا . پادشا کە لێکی دەکاتەوە دەبینێ لە سەرەوەی هەموان ناوی خۆی نووسراوە . بە وەزیر دەڵێ :

– یانی چی ناوی منت لە ڕیزی سواڵکەران نووسیوە ؟

وەزیر دەڵێ : قوربان تۆش سواڵکەری بەڵام فەرقت لەگەڵ ئەوانی دیکە ئەوەیە کە ئەوان دەپاڕێنەوە بەڵام تۆ بە زۆری دەیستێنی .

کابرایەکی لادێیی گوێدرێژەکەی لێ ون دەبێ زۆر بە شوێنیدا دەخولێتەوە بەڵام بۆی نادۆزرێتەوە .هەروا لە قەراغ جادە دەچێتە قاوەخانەیەک کە تۆزێک بحەسێتەوە . دەبینی کچێک و کوڕێک پێکەوە قسە دەکەن کوڕەکە دەڵێ :

– گیانەکەم هەر چاولە چاوت دەکەم دونیام لێڕا دیارە "

کابرا بەپەلە دەچێتە پێش و دەڵێ :

– کاکە بە قوربانت بم بزانە کەرەکەی من لەوێدا نیە ؟!!

★ ★ ★

● ● ●

جارێک سواڵکەرێک دەچێتە لای موعتادێک و دەڵێ :

– لەرێی خودا دا شتێکم دەیە .

موعتاد لەوەڵامدا دەڵێ : بەم شەقامەیدا برۆ. دەگەیە سێ شەقامان شەقامی هەوەڵ نا ، دووهەم نا ، سێهەم دەگەیە سێ کووچان ،کووچەی هەوەڵ نا ، دووهەم نا ، سێهەم دەگەیە سێ ماڵان، ماڵی هەوەڵ نا ، دووهەم نا سێهەم ، راست وەژوورر دەکەوی ،سێ سندووقی لێیە . سندووقی هەوەڵ نا دووهەم نا ، سێهەم قورئانێکی تێدایە . بەو قورئانەی هیچ شک نابەم !

● ● ●

کەڵەباب هەرای مریشک دەکا دەڵێ :

– گیانەکەم بۆچی ئەمجار هێلکەکەت رەقە ؟

مریشک بە نازو عیشوەوە وەڵام دەداتەوە و دەڵێ :

– دوێنی شەوێ آنفۆلانزام گرتبوو کەمێکیشم تەب هەبوو .

**تێبینی :** لە پڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بە پێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە رەچاو کـــراوە جگە لەوەی نیشانەی(٧) دانەنراوە.واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی( شڕ، گوڵ،زۆر ،شێرو . . )ی تێدا بێ بە شکڵی(شر ،گول،زور ،شیرو . . )دەنووسرێ.

| ١٥ | ١٤ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٠ | ٩ | ٨ | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | ■ | | | | | | | | | | | ١ |
| | | | | | | ■ | | | | ■ | | | | | ٢ |
| | | ■ | | | | | | | | ■ | | | | | ٣ |
| ■ | | | | ■ | | | | | ■ | | | ■ | | | ٤ |
| | | | | ■ | | | | | | ■ | ■ | | | | ٥ |
| | | | | | ■ | | | ■ | | | | | | | ٦ |
| | ■ | | | | | | ■ | | | | ■ | | | | ٧ |
| | | | | | ■ | | | | | ■ | | | | | ٨ |
| ■ | | ■ | ■ | | | | | | ■ | | | | ■ | | ٩ |
| | | | | ■ | | | ■ | | | | | | ■ | | ١٠ |
| | | | | | | ■ | | | ■ | | ■ | | | | ١١ |
| ■ | | | ■ | | | | | | ■ | | | ■ | | ■ | ١٢ |
| | | | | | ■ | | | | | | | | | ■ | ١٣ |
| | | ■ | ■ | | | | | ■ | | | ■ | | | | ١٤ |
| | | | | | | | ■ | | | ■ | | | | | ١٥ |

١ ـ شاعیرێکی بە ناوبانگی کورد کە بەیتی شێخی سەنعانی داناوە ـ تەختەیەکە کە لە تاوڵ و ڕەشماڵ ، کوتێکی بۆ ئازەیەتی لە ئەستۆ دەکەن ٢ ـ دار لە خۆی نەبێ ناقەڵشێ ـ پیتێک و سێ پیت ـ پشوو لە ڕێبوار دەبڕێ ٣ ـ پشتی ئەسپی پێ دەخورێنن تا ئارەقی بشکێ ـ ژنی تازە زاو ـ پیاوی ئەوتۆ باش نیە ٤ـ پیتێک لە ئەلف و بێ ـ هەوای بێ پاشەڵ :ـ بارەبەری سەحرای وشک و قاقڕ ـ بۆ زستان شەوێک ، بۆ بۆران . . . ێک ، بۆ پیران تەوێک ٥ ـ لەو لاوە لەگەڵ بارە ـ ئۆقرە گرتن و داسەکنین ـ بریا عەرەبیش ئەوەیان نەبا ٦ ـ چارەڕەشی و کەم بەختی ـ وەڵامی مەنفی ـ دەنگی ئەسپی هەرە بەکەیف ٧ ـ ئاخرین ماڵی هەموو کەس ـ تەڕ نیە ـ بەدوان دەبنە تایەک ٨ ـ شاری کەویری ئێران ـ باشترین دۆستی تەنیایی ـ جۆرە تفەنگێک ٩ ـ بیر و فام و تێگەیشتن ـ لەگەڵ باکوت ڕێ لە ڕێبوار دەشێوێنێ ١٠ ـ بە لێوان لێدەدرێ ـ ئەگەر ژان نەبێ نیعمەتی خودایە ـ یەرەڵماسی بەراستی کوردانە ـ ١١ ـ کز و لاواز . ـ ئێستاش مەنجەڵ و ئامانی لە گەورە ماڵان ماوە ـ ئەوی چۆلی بە قوزگیرێ ١٢ ـ دووپات بێتەوە پیران دەگریەنێ ـ دیواری دەورەی قەڵا ـ لە ماری وا مەترسێ ١٣ ـ لە باتی " ملمّع " لە کوردیدا داتاشراوە ـ ماڵاتێکی ئەو ئەندامەی شۆڕ و تەسک بێ نارەسەنە ـ ١٤ ـ دوو کیلۆ ـ چ کەسێک ـ جوان و دەلال ـ دەلاقان دەوەستێ و هێندێک دەستبڕ لێی دەبڕن ١٥ ـ پەمۆی هەلاجی کراو ـ گێژ و کاس ـ کوێستانێکی بەرزی کوردستانە بەناوی بەردێکی مێژوویی یەوە کراوە ـ .

١ ـ فەرهەنگێکی کوردی بە کوردیە ـ ڕەوەک ٢ ـ پێوەکردنی زەنگیانە و سازکردنی گوریس و پەتک ـ منداڵی بێباوک ٣ ـ هەراوهوریا ـ سفەتی هەڵۆ و بیاوی هەڵکەوتە ـ ژمارەیەک ٤ ـ هەڵکەوتوو ـ ڕۆژی پێش ئیمڕۆ ـ پێشگرێکە بۆ فیعل ٥ ـ هەر کەسێک بیکا مەنعی من و . . . . لەماڵی بمرێ ڕۆژی هەشت و نۆ ـ کەل و پەل ٦ـ تایفە ـ لە هەتاو دەبێتەوە ـ لە ئەندامە دوانەکانی لەش ٧ ـ زاراوەی تایبەتی دەروێشانە ـ هی عوبەیدی زاکانی‌یە و ئەحمەدی قازی کردوویە بە کوردی ٨ ـ .ڕێ پێوان ـ زەوی ترکان ـ یەکێک لە تامەکان ٩ ـ کوردی شیمال بە خۆشخوانانی دەڵێن ـ کەوڵەکەی بە نرخە ١٠ ـ پیاوی ئازا بەری نادا ـ دووجار بڵێی دادڕ دادڕ دەبێ ـ دێمەکار نەیبێ هیچی لێ ناڕوێ ١١ ـ دەنگدانی مەڕ ـ پەراوێزی لێفە و کولێجە ـ دۆستی وا زۆر باشە ١٢ ـ ئەشکەوتێکی بەناوبانگی موکریان ـ جانەوەرێکی وەکوو قرنوو و گەنەیە بە ئازەڵەوە دەنووسێ ١٣ ـ هێشتا ورد نیە ـ گوندێکی زۆر خۆشی کوردستانە لە خۆشناوەتی ـ پێغەمبەری جوانی زیندانی ـ هی ئەسپ هەرچی جوانتر بێ پەسندترە ـ کوێستانێکی باسەفای کوردستان ـ تووک و نفرین ـ ئەو بەفرەی با هەڵیدەچنێ ـ لا ـ هێلانەی گیان لەبەری نینۆکدار ـ

**پڕکراوەی جەدوەلــی ( ٢ )**

| ١٥ | ١٤ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٠ | ٩ | ٨ | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ن | ■ | ی | ن | ا | ح | ی | د | ە | م | ح | ە | ڕ | ■ | س | ١ |
| ک | ر | ا | ی | ■ | ر | ا | و | ە | ە | ■ | و | ە | ت | پ | ٢ |
| و | ا | ر | و | ت | ■ | س | ■ | و | و | د | ■ | د | ە | ی | ٣ |
| ە | ن | د | ■ | ە | ن | ا | و | ی | د | ی | ل | ە | و | ■ | ٤ |
| ر | ک | ■ | ت | خ | ە | و | ■ | ر | ا | ز | ■ | پ | ا | ن | ٥ |
| و | ■ | پ | و | ح | ■ | ل | و | د | ■ | ە | د | ■ | ر | و | ٦ |
| ک | و | ا | ل | ک | ش | ■ | ش | ە | ب | ل | ە | ک | ■ | ا | ٧ |
| ■ | ی | ر | ە | س | ک | ە | ی | ■ | ■ | ە | ر | و | و | ل | ٨ |
| ە | ■ | س | ■ | و | ■ | ن | ا | د | د | ■ | ا | م | ■ | ە | ٩ |
| ە | م | ە | چ | ل | چ | ■ | ر | ە | د | ی | ب | ا | ڕ | ■ | ١٠ |
| و | ■ | ن | ا | ە | ا | م | ■ | ر | ا | و | ە | س | ا | ڕ | ١١ |
| ر | و | گ | ■ | ی | ■ | س | و | و | ن | و | ■ | ی | و | ە | ١٢ |
| ی | ش | ■ | ە | م | گ | ■ | ن | ا | ە | ■ | ل | ■ | ی | س | ١٣ |
| ■ | ە | ل | و | ا | ی | س | ■ | ز | ■ | ک | و | و | ن | ت | ١٤ |
| ل | ک | ■ | ش | ن | ا | م | ■ | ە | ش | و | ە | ن | ە | و | ١٥ |

* * * * *

دەتوانن پڕکراوەی ئەم جەدوەلەمان بۆ بەرێ بکەن. لە نێو ئەوانەیدا کە دروستیان پڕ کردبێتەوە بە پێی قورعە یەک کەس بە بەرندە دەناسرێ.جایزەی بەرندەی جەدوەل بریتیە لە ساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروە . بەرندەی جەدوەلی ژمارە ( ٢ ) **لە** تەورێزەوە کاک خالیدی دەیلەمی‌یە .

# گاڵتە لەگەڵ نووسەرانی سروە «زیانی خورۆ»

سەروتار: "نووسەری ئێمە دوو ئەرکی گرینگی لەسەر شانە "

**ـ یەکەم ئەمەیە کە خەیاڵی خاوی چاپی کتێب لەسەری وەدەرخا، دووهەم ئەمەیە کە ئەگەر بەکەیفی خۆمان نووسرا وەکەمان گۆڕی لێمان نەتۆرێ .**

سمایلی قەزاق " تەمەنمان وەک دڵۆپە بارانێکە....بەرداشێک دەسووڕێنێ .... رەشماڵێک دەڕووخێنێ ... گوڵ و گیا و شینکە وەک لباد دەپەستێوێ ... "

**ـ ئەوە دڵۆپە باران نیە دێوی نەمەدماڵە**

خودا لێ خوشبوو سەدیقی مەحموودی: " شیعر چیە ؟"

**ـ شیعر ئەوەیە کە لە کاتی چاپکردندا دێڕێکی بپەڕێنن بۆ ئەوەی فۆڕمی لاپەڕەی گۆڤار تێک نەچی .**

کەریمی قەیوومی : " رەشماڵی ئەوین ئەستوندەکی تاوڵی لەسەر کوێستانی دڵمدا کوتاوە .... نازانم بڵێم چی ؟ "

**ـ هیچ مەڵێ! چاوەڕوانی " چرای فوو پێداکراو " بە ، بزانە 'کەی نەوتی لێ دەبڕێ " ؟**

عەزیزی فازیلی " قەلە رەشە ... لوور بۆوە و راماڵی بردە سەر پاڕووە سابوونە بۆنخۆشەکە .... "

**ـ هێندێکیشی لە چیرۆکەکەی تۆ رفاند بۆیە تەواوی چاپ نەکراوە .**

ئاودێر : " جا چ لە کیژۆلەیەکی جوان و لەبار و تازە بووکێک چاتر دەتوانێ میر ئاشت کاتەوە ... ئەو باوەش لە دەورانی ئاناهیتاوە ماوەتەوە " .

**ـ ئەدی بۆ دەڵێن ئاناهیتا کچە؟وادیارە سەدان ساڵ کڵاوی لەسەر خەڵک ناوە و پیاو بووە و نەیدرکاندووە .**

جەدوەل :

**ـ باشترین رێگا بۆ تێکدانی رێنووسی کوردی و سەرلێ شێواندنی ئەوانەی گرِ و گاڵی کوردی فێربوونیانە .**

مەحموودی شکاکنیژاد : " ئەودەم کە شوان بووین و گاوانیمان دەکرد...."

**ـ هێشتا شارتان بە قوڕ نەگرتبوو.**

مووسا گەرمیانی : " جنێو چ جنێو ؟ شتی وایان دەگوت بەردی دەتواندەوە"

**ـ خۆ سەخڵەت مەکە! هەقی خۆت بوو.**

سەلاحی عەرەبی: " ناسینیەوە،شیعری کوێی بوو... لەبەر دەمی لێک هاڵان و پێی هەڵگەڕان ... ئەوکیان رێک کوشی. رەنگی بزڕکا .... لاقی جووت کرد و سەری نایەوە"

**ـ هەتا دەردەکەت پیس‌تر نەبووە و منداڵە وردکە وەدوات نەکەوتوون خۆت بگەیەنە دوکتۆری شێتان.خودا شەفات بدا .**

**سروە:** زیانی خورۆ هێندە خۆت لە قەرەی لادێ مەدە

ئێمە دەزانین چ لە زیانی خورۆ دەکەن!

# فاڵی حافز ...؟!

فەرهادی قازی

یەکێک دەیگێڕاوە کە چەند ساڵ لەمەوبەر لە دێیەکی لای شیراز سپای دانیشبووم، ئەو سەردەمەدا سپای دانیش قەدر و ئیحترامێکی زۆریان هەبوو. هەرکەس ناڕەحەتییەکی بووبایە یا کارێکی بۆ هاتبا پێش دەهاتە لای من و چارەی لێ دەویستم و بۆ هەر کارێکی خێر و شەڕ ئەمنیان وەپێش دەخست. هەر بەو هۆیە لە ماوەیەکی کەمدا دەگەڵ زۆربەی خەڵکی ئەو دێیە ئاشنا بووم.

ڕۆژێک کابرایەک بە ناوی یار موحەممەد هاتە لام وگوتی:

**ـ بە قوربانت بم دەبێ فاڵی حافزم بۆ بگریەوە.**

جوابم داوە:

**ـ بابە لە کۆڵم بەوە من چووزانم فاڵت بۆ بگرمەوە.**

بەڵام دەست هەڵگر نەبووگوتی:

**ـ وەڵڵا ئەمن سەوادم نیە بەڵام ئیمانم بە حافز هەیە کەرەکەم ون بووە و دڵنیام دەیبینییەوە.**

هەرچی شێر و ڕێویم بۆ هێناوە و کردم و کرانەدم دەستی هەڵنەگرت. ناچار دیوانی حافزم هێنا و لاپەڕێکم هەڵداوە. غەزەلەکەم لە هەوەڵرا تا ئاخرێ خوێندەوە بەڵام هیچی لێ حاڵی نەبووم. دەهاتم ناهومێد بم کە لە ئانێکدا ئەو میسرەعە:

**ما در پیاله عکس رخ یار دیده‌ایم**

فیکرێکی خستە مێشکمەوە لە دڵی خۆم وام دانا:

ئەگەر "رخ" وەرگێڕی دەبێتە "خر". "یار"یش مەبەستی "یار موحەممەد"ە کەوابوو حافز کەری یار ـ موحەممەدی دیوە. بەڵام لە پیاڵەدا! دەبێ مەبەستی چ بێ؟

هەرچی فکرم لێ کردەوە بۆم نەچووە سەریەک. لە حاڵێکدا پێکەنینم بەو تەفسیر و لێکدانەوەی خۆم دەهات بۆوەی ئەو کابرایە دەستم لە یەخە کاتەوە گوتم:

**ـ وەڵڵا یار موحەممەد! حافز کەری تۆی دیوە بەڵام لە جێیەکی سەیر.**

زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی:

**ـ لە کوێ؟ لە کوێ؟**

گوتم:

**ـ دەڵێ لە ... لە پیاڵەدا!**

پێم وابوو هەر ئێستا قاقا پێم پێدەکەنێ بەڵام بە پێچەوانە زۆرم بە قوربان و سەدەقە بوو و بەپڕ تاو ڕۆیی. زۆرم پێ سەیر بوو بۆ وای کرد.

سبەینی بەیانی دیتم یار موحەممەد بە قابلەمەیەک ماست و قاپێک شیرێژ و ڕۆن هاتەوە لام و گوتی:

**ـ ڕاوەستە دەستت ماچ کەم.**

**ـ چ بووە بۆ وا دەکەی؟**

**ـ جا چۆن بە قوربانت بم کەرەکەت بۆ دیومەتەوە.**

بە سەر سوڕمانێکی زۆرەوە گوتم:

**ـ کوڕە جا چۆن؟**

**ـ مەگەر نەتگوت حافز کەرەکەتی لە پیاڵەدا دیوە، پیاڵە دێیەکی چووکە لەپشت هۆو تەپکە. دوێنێ چووم و کەرەکەم لەوێ دیتەوە.**

دایکی جەرگ بڕاو بە دڵێکی پڕ لەخەم و خەفەتەوە لە قولینچکی وەتاغەکە دانیشتبوو.جار جار دەستی هەڵدێنا و رووی لە ئاسمان دەکرد و ورتەیەکی لێ دەهات وەک بپارێتەوە وابوو . تاوتاو دەینالاند و جارجاریش مات دەبوو و چاوی لە گۆشەیەکی وەتاغەکە دەبڕی.

ئەورۆ بەیانی بوو کە ماڵە خۆشەویست و ژیکەلانەکەی ئەویان کە تەنیا یادگاری مێردە خوالێ خوشبووەکەی بوو لە وەتاغ بردبووە دەر .

لە باوەشی گەرمی دایکیان کردبۆوە و لە ئامێزی ساردی گلّیان هاویشتبوو .

چرایەکی کەم نوور لە نێوەڕاستی وەتاغەکەدا دایسا جار جار پتە پتێکی دەکرد. دەتگوت نەفتی لە بڕانە، پیخەفی منالەکەی کە ئێستا خڕی نەکردبۆوە هەروا لەو قوژبنەی کە ئەو چاوی تێ بڕیبوو راخرابوو و دیمەنی پڕ لە خەم و نائومێدی وەتاغەکەی، خەماویتر لە دەرەوەی ماڵەکە تاریکێکی تەواو بەسەر ولات دا زاڵە ، بایەکی ساردی پایزی دێ ، وەک دێوێکی قەلس و تووڕە ، گەلای زەرد و بێ تاقەتی دارەکان لێ دەکاتەوە و بۆ ئاسمانیان دەبا و بەتەواوی هێزەوە لە ئەرزیان رادەکێشێ و لە خاک و خۆڵیان دەگەوزێنێ . دارەکان پشتیان لەژێر هێزی ئەو بایە دەنوشتێتەوە لق و پۆیان لێک دەهاڵێ و دەناڵێنن ، جارجارەش لقی هیندێک لە دارەکان کە ناتوانن لە راستی هێزی ئەو تۆفانە خۆ رابگرن دەشکێن و قرچە قرچی شکانیان دەنگ دەداتەوە و لەگەڵ دەنگی باو لووره لووری سەگ و گرمەی هەور و ناڵەی ئینسان تێکەڵ دەبێ و دنیایەکی بەسام و پر لە خۆف بەدی دێنێ. لەپڕ ژنی چاو پڕ لە فرمێسک سەری هەڵدێنێ و چاو لەلای پەنجەرەی وەتاغەکە دەبڕی وەک وەیە کە دەنگێکی بێتە گوێی :

دایەگیان ... دایەگیان ...

ـ ئەو دەنگە چیە ؟

دیسانیش ئەو دەنگە ئەوجار دەڵێی بە پتە لە شووشەی پەنجەرەکە دەدەن ، دووبارە دەنگەکە دەبیسی :

ـ دایە گیان .....

دایکی چارەڕەش ولێقەوماو بێ وەی کە بۆ خۆی بیەوێ هەڵدەستێ و بۆلای پەنجەرەکە رادەکا و بە حاڵەتێکی پڕ لە نائومێدی و ترسەوە چاو لە دەرێ دەکا و لەژێر لێوێوە دەڵێ :

ـ سەیرە ، ئەوە چ بیر و خەیاڵێکە ؟ منداڵە بەستەزمانەکەی من ئێستا لە ژێر گڵی دایە ، نا .... ئەوە ناڵە ناڵی بایە ، ئەو دەنگەشئی ئەو دارانەیە کە با لە شووشەکەیان دەدا . حەیف کە کەس لە دنیای دیکە را ناگەڕێتەوە ، بەڵام گوێ بدەیە دیسانیش دەنگەکە دێ ! ...

ـ دایە گیان ...دایە گیان ... بۆ دەڵێی منت لەبیر چۆتەوە ؟

ـ بۆ منت لەو سەرمایەدا لە دەرەوەی ماڵێ بەجێ هێشتووە ؟ بۆ ئیتر لە باوەشم ناگری و گەرمم ناکەیەوە ؟ نازانی من لە تاریکی دەترسێم ؟... هۆوە جێ و بانی منە کە دوێنێ شەوێ لەسەری نوستبووم؟ تۆش لەکن من دانیشتبووی و بوو.خۆر تیشکی گەرمی بڵاو دەکردەوە و وڵاتی گەرم دادێنا ، لە ئاسمانی شینەدا کە هەورە سپیەکان بە ئەسپایی دەرۆیشتن لەهەر جێیەک گوڵێکم دیبایە لە چڵێم دەکردەوە و بۆم دێنای بەڵام تۆ زۆر جار فرێت دەدا و دەتگوت :

ـ ئەوە گیایە ، گوڵ نیە .

لە لقی هیندێک لەوان شیرێکی سپی دەهاتە دەرێ کە دەستمی تاڵ و لیچق دەکرد و قامکەکانمی پێکەوە دەنووساند . من زۆرم پێ سەیر بوو بەڵام تۆ قەدەغەت کردبوو : کە من ئەو گیایانە لێنەکەمەوە و زۆر جار ئامۆژگاریت دەکردم و ئاوت بە زارمەوە دەکرد . جار جاریش فرمێسکەکانت دەکەوتنە سەر روومەت و سەرینەکەی من ، پێم وایە بۆ بابم دەگریای ، ئەمنیش چاوم هەڵدێنا و دەمڕوانیە تۆ ، چاوەکانت پڕ لە عاتیفە و خەم بوو ... ئەدی چ بوو کە بە جارێکی ئەو هەموو خۆشەویستت لەمن هەڵبری و منت لە خۆت دوور کردەوە و لەسەرما و تاریکیدا تەنیات هێشتمەوە ؟ ....

داخوا ئەو رۆژە خۆشانەت لەبیر چۆتەوە ؟... دەشت و چیا کەسک و شین بوو ، دارەکان بە کەیف و سەرخۆش بوون ، هەموو لایەک گوڵ و گوڵزار دەتگوت :

ـ هەرکەس گوێ نەداتە قسەی دایکی تەمەنی کورت دەبێتەوە .من مانای ئەو قسەی تۆم نەدەزانی .

رۆژێکی گوڵێکی سپی و جوانم دی.کە وەک گوڵەکانی دیکە نەدەچوو.داهاتمەوە کە لێی کەمەوە بەڵام گوڵەکە لەجێی خۆی بڵیند بوو ، رووی دەئاسمانێ کرد . سەرم سوورما و دڵم کەوتە کوتان ، وا دیار بوو رەنگیشم پەڕیوە جونکی گوتت

ـ رۆڵە گیان مەترسێ ئەوە گول نەبوو پەپوولە بوو گوتم :

ـ پەپوولە چیە؟ گوتت :

ـ باڵندەیەکی بچکۆلانە و جوانە کە لەسەر گوڵان دەنیشێ و شیرەی وان دەمژێ.

من چاوم لە دەور و بەری خۆم کرد بەڵکوو دووبارە پەپوولەیەکی دیکە ببینمەوە بەڵام ئەو رۆژە ئیتر پەپوولەیەکم نەدیەوە . رۆژەکانی دوایی جار جار یەکێک لەوانم دەدی،زۆریان باڵیان سپی بوو هیندێکیشیان زەرد یا سوور بوون من دەمویست یەکیان بگرم بەڵام هیچ کات نەمدەتوانی. ئەو رۆژانە چەند خۆش بوون .ئەورۆژە گەرمانە.... وەک ئێستا سارد نەبوو. من هەر رۆژە شتێکم دەدیەوە و لە تۆم دەپرسی کە چیە !

تۆش هەر جارە شتێکی تازەت فێر دەکردم. هەموو شتێکم پێ سەیر بوو.

حەیف کە ئەو رۆژە خۆشانە زوو تێپەڕین. خۆر ئەوجار کەمتر دەهاتە دەر، جار جار دەباری، ئەرز تەڕ دەبوو، لە دەوری ماڵەکان ئاوی باران جۆگەلەی ساز دەکرد، تۆش بۆوەی وەڕەز نەبم لە پشتی پەنجەرە را بارینی باران و ئەو بڵقانەت پێ نیشان دەدام کە بە دڵۆپەی باران لەسەر ئاوی جۆگەلەکە دروست دەبوو من زۆر جار دڵم تەنگ دەبوو بزۆزیم دەکرد و تۆش لێم توورە دەبووی بەڵام من بەو کارە سەرگەرم دەبووم.

ورده ورده رۆژەکان ساردتر و رەشتر دەبوون، رۆژێکی بەیانی کە هەستام هەستم کرد لەشم گەرمە، لاقەکانم بێهێزە و پێم خۆش نیە لە جێگا بێمە دەر، تۆش کە منت بەو جۆرە دی رەنگت گۆڕا و گوتت:

- رۆڵە گیان تۆ ئەورۆ دەبێ لە جێگا دابی، دوێنێ سەرمات بووە، لەشیشت گەرمە شتێک نیە تا سبەینێ چا دەبییەوە و دەتوانی هەستی و کایە بکەی.

بەڵام سبەینێ ئەو رۆژە حاڵم خراپتر بوو. رۆژی دوایی پیاوێکی قەڵەوت هێنا کە چاویلکەی لەچاو دابوو. کەمێکیشی ردێن لەسەر چەنەگەی هێشتبووە، گوتت:

- ئەوە ئاغای دوکتۆرە.

ئەمن لە چاوەکانی دەترسام، دەستی گرتم و شتێکی لەسەر سینگ و پشتی دانام و گوێی هەڵخست نازانم چ بوو؟ دوایی زۆر لەگەڵ تۆ دوا، پاشان شتێکی لەسەر قاقەز نووسی و دایە دەست تۆ لەو رۆژەڕا دەرمانی تاڵ و ناخۆشت دەرخوارد دام ئەوجار حاڵی تۆش وەک جاران نەبوو کەمتر قسەت دەکرد و ئیتر پێ نەدەکەنی، دوێنێ حالم لە هەموو رۆژێک خراپتر بوو.

ئێوارە چاوەکانم بەست و نووستم و ئیتر رووی تۆم نەدیەوە. جار جار دەنگت لە دوورەوە دەهات وەک وەی بوو کە دەگریای و دەتناڵاند.

دوایی خەونێکی ناخۆش و پڕ لە مەترسیم دی :... خۆمم دی کە بە چاوی بەستراو و رەنگی زەرد لەسەر گڵێکی سارد و نەرم نوستووم. کرمی سەیر سەیر لە دەور و بەری من لە ئەرزی دەهاتنە دەر و بۆلای من دەهاتن، مشکی گەورە گەورە دەستی یەکتریان گرتبوو بەجیکە جیک لە دەورم هەڵدەپەڕین و سەمایان دەکرد... دارەکان ریشەی خۆیان بۆ لای من رادەکێشا و تێم دەهاڵان.

دایەگیان. دووری تۆ بەسە. دەرکەی بکەوە و رێم بدە دیسان لە کۆشی تۆدا دانیشم و دەستت لە ئەستۆی کەم، دەمەوێ ماچت کەم و هیچ کات لێت جوێ نەبمەوە.

با ئەم خەیاڵەی تێکەوە پێچا و لەگەڵ خۆی بۆ سنووری نادیاری برد.

هەر ماڵێکی ئێرانی کە قورئانێکی پیرۆزی لەسەر تاقە دانا بێ پێویستە دیوانێکی حافزیشی لەبن بێ. منیش دەڵێم خۆزگە هەموو ماڵە کوردێکیش دیوانی نالی لەژێر قورئانی پیرۆزدا دانابایە. (هێمن)

رەنگبێ زۆرکەس خەریکی کۆ کردنەوەی شیعرەکانی نالی بووبن بەڵام لە هەمووان تەواوتر و رێک و پێکتر ئەم کتێبەیە کە مامۆستا عبدالکریمی مودەڕیس و کوڕەکانی شەرحیان لێ کردووە و ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی لەچاپی داوەتەوە. دیوانی نالی یەکێک لەو کتێبە بە نرخانەیە کەهەموو ئەدەبدۆستان بە تایبەتی شاعیرە لاوەکانمان دەبێ بیخوێننەوە و هونەری شاعیری و سەنایعی شیعری لێ فێر بن.

کۆ کردنەوە و شەرح لێکردنی دیوانی میرزا عبدالرحیمی سابڵاغی (وەفایی) شوێنەوارە بە نرخەکەی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی یە. ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی لە چاپی داوەتەوە.

لەم کتێبەدا شیعرە کوردیەکانی مامۆستا وەفایی دیارن.

"کە تۆ رۆیی لەبەر چاوم کورەی خاکی بە ئاوا چوو
لەپاش تۆ ئەی گوڵی نەوڕەستە خاکی کوێ بە سەردا کەم"

کتێبی شاری ویران نووسراوی عەلی حەسەنیانی "هاوار". لێکۆڵینەوەیەکی بە رێ و جێ لەسەر شاری وێران، نامەیەکی مێژوویی بەهاری کوردستان، چیرۆکی لەگلەگ، موسیقای خۆماڵی، بەشێک لە نێوەرۆکی ئەم کتێبەن. وتاری شیعری کوردی هەشتەمین وتاری ئەم کتێبەیە هەروەها ژن بە ژنە و ئاڵەکۆک و چاکی خاڵەسووە و "ج بنووسین" بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبە پێک دێنن.

تێبینی: لەسەرلەچاپدانی دیوانی نالی و دیوانی وەفایی پێویستە روونی بکەینەوەکە لەهەل ومەرجی ئێستادا نەمانتوانیوە ئیجازەی چاپ لەدانەرانی ئەوکتێبانە مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس وکوڕەکانی ومامۆستا قەرەداغی وەربگرین. راوەستان لەسەرپێک هاتنی هەل ومەرجێکی لەبار بۆئیجازەوەرگرتن دەبووەهۆی وەدواکەوتنی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە بەنرخانە. بەتێ ڕادیویەک کەلەوما مۆستا پایەبەرزانەمان هەیەدڵنیایین لەم کارەمان کەتەنیا بۆ خزمەت بە فەرهەنگ وئەدەبی کوردیمان کردووە دڵمەند نابن.

دیارە مافی دانەرانی ئەم دووکتێبە دەپارێزرێ وهەرکات بۆیان بگونجێ پەیوەندیمان لەگەڵ بگرن، لەسەرچاوی دادەنێین. خۆشمان بۆ پەیوەندی گرتن لە هەوڵداین.

- کرد در تاریخ همسایگان : سیاحتنامهٔ اولیا چلبی
  ترجمهٔ فاروق کیخسروی
- کۆیلەی راپەڕیو : نووسەر : تی.واشینگتۆن
  وەرگێڕ : م . بەهرەوەر

## چاوەڕێی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبانەش بن

- کاروانی خەیاڵ : بەشێک لە شیعرەکانی خالیدی حیسامی ( هێدی )
- یادداشتهایی از کردستان : خاطرات شیخ رئوف ضیائی.به کوشش ( عمر فاروقی )
- قامووسی زمانی کوردی : دانەر : م . ئ . زەبیحی
- بسوی جهان جاویدان : اثر ملا عبدالله احمدیان .
- فەرهەنگی ناوە دوانەکانی کوردی : دانەر : تاها فەیزی زادە .

---

فۆڕمی ئابوونمانی گۆواری سروە

من ........................ سەد و دە تمەن ( ۱۱۰ ) پووڵم بە حیسابی ژمارە ۵۴۰۰ ی بانکی سپە ، شوعبەی مەرکەزی ورمێ، ( اورمیه ) بە ناوی ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی بۆ ناردوون . داوا دەکەم لە ژمارە............ ی سروە بە دوام جار لە گەڵ جار بۆ بنێرن ، ناو نیشانم ئەمەیە :

ناونیشان : ....................................................

....................................................................

پاشماوەی سەرداری ....

پێ دەگەیشت . بەڵام پارێزەرانی شار دەستیان بە هیچ جێگایەک ڕانەدەگەیشت و کەشتییەکی پڕ لە خواردەمەنی و کەرستەی شەڕیش کە سوڵتان صلاح الدین لە بێرووتەوە بۆی بەڕێ کردبوون کەوتە بەر پەلاماری خاچپەرستەکان و لە دەریادا نوقم بوو. سەرەڕای ئەمانەش پەتا و ئاهۆی جۆرا و جۆر لە شاردا بڵاو ببۆوە و برسێتی لە دانیشتوان و پارێزەرانی شار بڕیبوو. لە وەزعێکی ئەوتۆدا " ئەمیر سیف الدین علی ـ المشطوب " فەرماندەی پارێزەرانی شار چووە لای پادشای فەرانسە و پێی گوت: "ئێمە شارەکەتان تەسلیم دەکەین بە شەرتێک ئێوەش عەینی معامەلەمان لەگەڵ بکەن ( ۹ ). فیلیپ ئۆگوست لە بەرانبەر ئەم پێشنیارەدا گوتی : " من قەت رازی نابم کە لە خەڵکی عەکا و مودافیعینی یەکێک ساغ بمێنێ (۱۰)". شار ماوەیەکی تریش خۆی راگرت ، بەڵام برسییەتی و نەخۆشی ناچاری کردن لە ۱۷ی رەجەبی ساڵی ۵۸۷ " ۱۲ی ژووئیەی ۱۱۹۱ی.ز" دا خۆ بەدەستەوە بدەن . خاچپەرستەکان کوشتارێکی بە کۆمەڵیان لە خەڵکی عەکا بەرپا کرد و نزیک بە سێ هەزار کەسێکیان لێ کوشتن .

دوای ئەمەش شەڕ کۆتایی نەهات و لە چەندین جێگا هێزەکانی هەر دوو لا بە گژ یەکدا چوون و زۆر جاریش لەشکری موسڵمانان زەبری کاریگەر و توندی لە خاچپەرستەکان وەشاند.تاکوو سەرەنجام پادشای ئینگلیس " ریچارد" پێشنیاری ئاشتی هێنایە گۆڕێ و لە (۲۲ ی شەعبانی ۵۸۸ ی.ک ۱۱۹۲ی.ز"دا پەیمانی ئاشتی مۆر کرا و بەپێی ئەم پەیمانە شاری قودس و هەموو خاکی فەلەستین جگە لە بارێکەیەک لە " سوور "ەوە تا عەکا ، بە دەست موسڵمانەکانەوە مایەوە و رێگا بە مەسیحییەکانیش دەدرا کە لە حەج و زیارەتی شوێنە پیرۆزەکانیاندا ئازاد بن .

( درێژەی هەیە )

( ۹ ) و ( ۱۰ ) کورد و کوردستان ـ ئەمین زەکی بەگ ل ۱۷۰ .

روون کردنەوەیەک لەسەر فۆڕمی ئابوونمان

ئەو ۱۱۰ تمەنەی کە دەینێرن بو ئابوونمانی شەش مانگ یا ساڵێک نیە ، بەڵکوو بۆ شەش ژمارەی " سروە "یە کە خەرجی پۆستکردنیشی خراوەتە سەر ، دیارە بۆ داخوازان لە دەرەوەی وڵات زۆر و کەمی زێدە خەرجی پۆستیشی دێتە سەر ، کە بۆ خۆیان دەتوانن بەراوردی بکەن .

ا ورمیه : صندوق پستی ۷۱۷ ، تلفن ۳۵۸۰۰.

ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی

ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەیووبی

# بارگەی یاران

«هێمن»

دێت و رادەبرێ وەکوو سەروی رەوان من چ بکەم؟
کە بە قوربانی نەکەم رووحی رەوان من چ بکەم؟

قەدی ئەم شۆخە وەکوو دووخ و خەدەنگە ئەفسووس
پشتەکەم کۆمە وەکوو مالّی کەوان من چ بکەم؟

تازە هەنگاوی شلم کوانێ دەبێ بۆ شەو ڕاو
جوانە زۆر جوانە بەلێ رەوتی کەوان من چ بکەم؟

زەبری ئاوزەنگی بڕا و شل بووە دەستی جلّەوم
دێ دەنا پڕمەیی بۆر و بدەوان من چ بکەم؟

ژوانی خۆشی هەڕەتی لاوەتی دێتە خەونم
کاتی ئاویلکە دەگەڵ زیندە خەوان من چ بکەم؟

شەو هەتا رۆژێ لەبەر ئێشی لەشم نالّەم دێ
دێتە گوێم دەنگی گەلۆ و نیوەشەوان من چ بکەم؟

بارگەیان تێکەوە پێچا و بە ڕێ بوون یاران
لە دنێ وا بەتەنێ پاشی ئەوان من چ بکەم؟

ژیانی من ئێستە وەکوو خۆری دەمی زەردە پەڕە
پێم نەما تین و گوڕ و هێز و تەوان من چ بکەم؟

سروە هات خونچە گولّی باخی ئەدەب پشکووتن
باخەوانی گەرەکە تازە جەوان من چ بکەم؟

ئاو نەبوو ئەو دەمی هێمن مەلەوانی کورد بوو
ئاو شوکر زۆرە وەرن زوو مەلەوان من چ بکەم؟